FÊRBÛN
فێربوون






# چەند بابەتێکی
# زانستی تەسەووف

عەبدولڕەحمان بێلاف بەرزنجی

# چەند بابەتێكی زانستی تەسەووف

عەبدولڕەحمان بێلاف بەرزنجی

هەولێر - ٢٠١٩




فێربوون


ناوی کتێب: چەند بابەتێکی تەسەووف.

نووسینی: عەبدولڕەحمان بێلاف بەرزنجی.

پیتچنین: محەمەد عەبدولغەفور باقلانی بەرزنجی.

دیزاین: ڕێمان عەبدولجەبار ڕەحمان.

چاپ: یەکەم – ۲۰۱۹.

تیراژ: ( ۱۰۰۰ ) دانە.

چاپخانە: ( لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی فێربوون ) هەولێر.

نرخ: ( ٦۰۰۰ ) شەش هەزار دینار.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی( ٥٩٤ )ی ساڵی ( ۲۰۱۷ )ی پێدراوە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

- [ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ١٠ ][1].

- [ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيۡهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمًا ١٠ ][2].

( صدق الله العظيم )

١ – سورة الشمس، الآية ٩ و ١٠.

٢ – سورة الفتح، الآية ١٠.

# پێرست

# پێشەکی

الحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، وَالصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ عَلى خَيْرِ خَلْقِهِ سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ.

تەسەووف کەلتورێکی مەزنی نەتەوە موسڵمانەکانە، گەر باس لە مێژووی تەسەووف بکەین" لەبەر ئەوەی بە قووڵی گوزارشت لە پلەی باوەڕ دەکا، تایبەت نیە بە جوگرافیایەك، بە واتا بە شوێنێك، بەڵکو لە چەندان ناوەند و جێگەی جودا جودا سەریان هەڵداوە و لەیەك کاتیشدا بە چەندەها جۆر یاخود شێواز هاتۆتە کایەوە، لەبەر ئەمانە گرنگی خۆی لە قورئانی پیرۆز و حەدیسەکانەوە (حەدیسەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ) وەرگرتووە، تاکو ئەو ڕۆژەی گەیشتۆتە ئاستێکی بەرز، لێرەدا ئەوەی بە پێویست دەزانم دوای کامڵ و گەشەکردنی زمانی کوردی، ئەو کەلتورە بەرفرەوانە بە زمانی شیرینی کوردی بنووسرێتەوە، بێگومان مەبەستم لە نووسینەوەی هەر تەنها سەردەمانێك نیە کە ئەم زانستە وەك تەریقەت نەشونمای کردووە جێگەی دەرکەوتووە، بەڵکو ناسینیەتی لەسەر زەمینی کوردستاندا، چونکە نەتەوە موسڵمانەکانی دیکە، هەر لە زووەوە بە زمانی خۆی ئەم کەلتورەیان نووسیوەتەوە، لەگەڵ ئەوەی گەلێ تێکۆشانیان هەبووە، ڕەنگە بزانین زمانی عەرەبی ڕۆڵی هەبووە، بەڵام نەتەوەکانی تر چەندان سەدە پێش ئێمە بەزمانی خۆیان نووسینیان هەبوو، کەواتە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە کورد گەلێ هەوڵی هەبووە لە تەسەووفدا،

هـەر لـەو کاتـەی کـە سـەری هەڵـداوە و گەشـەی کـردووە و چـەندان پیاوچاکی تێدا هەڵکەوتووە، بەڵام نووسینەوەی ئەم کەلتورە بە زمانی کوردی لە ئارادا نەبووە، لەم ڕووەوە بۆ هەنگاونان بۆ نووسینەوەی ئەم لایەنە تاریکە دوو ڕێگە بە باش دەزانم: یـەکێکیان بـە نووسـینەوەی خودی زانستی تەسـەووف، هەروەها دووەمیان لـە ڕۆڵـی کـوردان لـەم کەلتورەدا. کە گومان لـەوە نیـە سەرچاوەکان ناوی گـەلێکیان هێناوە، چونکە خاکی ئێمە تیایدا کاریگەری و ڕۆڵی فرەوانی هەبووە.

لـەم ڕوانگەیـەوە ئێمـە هـەنگاوی یەکـەممان هەڵبـژارد، چـونکە هـەنگاوی دووەم پسـپۆڕی تایبەتمەنـدی دەوێ، سـەرەڕای ئـەوەی ئـەم پلـەی بـاوەڕە تـاکو ئێسـتاش لـە تەکیـە و خانـەقاکان ئـەدا دەکـرێ، هـەروەها لەلایـەن سـێ کەسیشـەوە دەنوێنـدرێ، بـەپێی زانیاریمان چ لەلایەنی تیۆری و چ لەلایەنی جێ بەجێ کردن لامان لێ کردۆتەوە، چونکە دەوروبـەری من وەك ژینگـەی ئـەو ڕۆژگارەیـە کە تەسەووف چ وەك زانست چ وەك پەیڕەوکردن ڕۆڵی هەبووە.

لـەم کورتـە نووسـینەدا کۆمـەڵێ تیـژی تەسـەووف وەك زانسـت هاتۆتەکایەوە، دەکرێ بڵێین هەر وتارێ بۆ خۆی سەربەخۆی هەیە لـە نـاوەڕۆکی خۆیـدا و هـەروەها هـەموویان بەسـەریەکەوە زانسـتی تەسـەووف دەگرنـەوە و پەیوەنـدیی و توندو تۆڵیـان هەیـە، لەلایـەکی ترەوە دەکرێ گەلێ فرەوان بکرێ، چونکە بابەتی پەیوەندیدار هێشتا گەلێك ماون، بۆیە ئەرکی یەکەم لـەم نووسینەدا زانینـی پلـەی بـاوەڕە جـا لـە چ سـەردەمێکدا هـەبێت، ئەمـەش لـەتاکی ئێمـەدا خـۆی حەشـارداوە، هـەروەها ئـەرکێکی تـر ئەوەیـە پەیوەنـدی ئـەم پلەیـە بەهەنـدێ بـارودۆخ و زانسـت و سـەردەمی تـرەوە چ دەگەیـەنێ؟!!!،

هەروا لە کۆمەڵێ ئەرکی تردا کاریگەری خۆی بەدەردەخا، ئەمەش لەکاتی خوێندنەوەی دا زیاتر دەردەکەوێ، دەبێ ئەوەش بڵێین بۆهەر بەشێك هەوڵدراوە تا ئەوەندەی دەکرێ قەڵەم لێی بخرێتە کار، بە واتا تیایدا قووڵ بێتەوە و بە هەموو بوار و لایەنەکانی دا گوزەر بکا.

لە ڕاستیدا بابەتەکانی تەسەووف هەتا بڵێی زۆرن، ئێمە لێرەدا لەم نووسینەدا گوڵبژێرمان کردوون، هەندێك بابەتمان ڕاڤە کردووە، بەڵام ئەگەر بەلای تەواوی بابەتەکان بچین لە ڕاستیدا کاری تاکە کەسێك نییە، بەڵکو دەبێ لیژنەیەك هەبێ و چەندان ساڵ بخایەنێ، لەبەر ئەوە لە خودی بابەتێکدا قووڵ بووینەوە، چونکە چەندەها ناونیشان هەن بۆ بابەتەکان کە تەسەووف لە خۆی دەگرێ، زانستی تەسەووف زانستێکی ڕوحی یە، هێندە فرەوانە کتێبی وا لەبارەیەوە هەن زیاتر لە سی بەرگ دەبن و هەزارەها لاپەڕە پێك دێنن، لەگەڵ ئەوەی ئەم نووسینە بەم شێوەیەی هیواداریین تێنوێتی خوێنەر لەباسەکاندا بشکێنی، لەبەر ئەوە لە خودی باسێکدا قووڵ بووینەوە و دەکرێ باسەکانی تر و لایەنەکانی تر بۆ ڕۆژگاری تر هەڵگرین، چونکە زانستی تەسەووف لە هەموو سەرچاوەکانی ئیسلامدا بە قووڵی کشاوە و سوودمەند بووە لێی سەرەڕای ئەو هەڵوێستانەی هەیەتی.

عبدالرحمن بێلاف بەرزنجی

یەك شەممە، ١٧ / ٣ / ٢٠٠٢

## له پێناو تەسەووف دا

گەر بمانەوێ باس لەو مەعریفانە بکەین کە لە سروشتەوە هاتوون، بێگومان کە دیاردەکان بەدی هاتوون، چونکە دیاردەکات لەمێژە دوور لە مرۆڤ لە جولە و خولانەوەدان و دەبینین بۆ خۆیان سوڕیان هەیە، یاخود بە شێوازێکی تر لە کوێوە بەدی هاتوون؟! کێ ئەم سوڕانە بەڕێوە دەبا؟! بۆچی بەم جۆرە ڕێکوپێکەوە، بە بەرنامە بەڕێوە دەچێ؟!!! ئەمانەش بەرەو پرسیاری ئەبەدی و سەرسامکەرمان دەبەن، حەتمەن لە دەرەوەی ئەمانەوە هاتۆتەدی، لەبەر ئەوە لەو لۆژیکەی بنیادمان ناوە و تەواو بڕوامان لەسەر پتەو کردووە دوور دەکەوینەوە و لە چەقێکی تر نزیك دەبینەوە، کە دەبێ ئەم جارە پاڵنەرێکی مەزن لە پشت ئەمەوە هەبێ، بێگومان لە گەردوون دا چەندەها پرسیاری سەرسوڕهێن هەن، ئەمانەش بۆخۆیان بۆ پێویستییەکمان دەبەن، بەو پێیەی ئادەمیزاد بەو عەقڵە و قەوارەی هەیەتی لە بەرامبەری دۆش دادەمێنێ، لە بەرامبەر هەموو گۆڕانکاری و پەرەسەندنی هەبوون و نەبوونەکان دەبێ چ هەڵوێستێکی بۆ بێتە کایەوە، بە واتا لە مەسەلە سەرچاوەکان چۆن دێتە کایەوە؟!! جا ئەم مەسەلانە کە دێنە پێشەوە چەندەها شێواز لەخۆ دەگرن و لە هەموو بوونەوەرێکدا بەدی دەکرێ و لە هەموویان دا بۆ سەرچاوەیەك دەگەڕێتەوە، چونکە خودی مرۆڤیش کاتێ وورد دەبێتەوە لەخۆی و لە دەوروبەری گەلێ چەمك لای کاکڵە دەکا و بەرە

و هەمان چەق دەیبا، هەر زوو درك بەوە دەكا كامەیان لە بەرژەوەندی دان و كامەیان لە بەرژەوەندی دابن، بۆ ئەوەی چاكە و خراپە فێربێ و لە پێناو هەموو ئادەمیزادەكان ئەو بەرنامەیەك جێ بەجێ بكا، لە ساتێكا ژیان بۆ خۆی پێناسەی خۆی دەكا، چونكە كاتی یە، بوون و نەبوونە، ئازارو ئەشكەنجە و خۆشی یە مەرگەسات و بەزمەساتە، ئەزموون و عەقڵە، هتد... بەڵام ئەوەی لەمانە گەورەترە و سەراپا ئەمانە و ئەم گەردوونەی لە خۆ گرتووە خاوەن هەموو پێناسە بەرزەكان و چاكەكان دا، خۆی سەرچاوەیە بەدی هێنەری ژیانە و واتای لە هەموو ئەوانەدا هەیە كە بوونن و دەبنە بوونیش.

لەو ساتەی ئادەمیزاد بەرامبەر هەرچی هەیە دادەمێنێ، دەیەوێ لە ئاو، لە هەوا، لە فڕین، هتد ووردبێتەوە، دادەمێنێ و بیردەكاتەوە: ئەمانە چین؟! لە كوێوە هاتوون؟! چلۆن بەم جۆرە كاردەكەن؟! بۆ كوێ دەڕۆن؟! حیكمەتی ئەمانەش ڕەنگە لەوساتەی دەست پێ بكا، كە ئادەمیزاد خۆی لە مەرگ دا ڕووبەڕووی دەبێتەوە، چونكە نەك تەنها مەرگی خۆی، بگرە مەرگی هەموو بوونەوەرەكان و گیانەوەرەكان و شتەكان بەچاوی خۆی دەبینێ، لە كاتێكا هەر كردەوەیەك خۆی یا بوونەوەرەكان دەیكەن، پاڵنەرەكە یان بۆ ئاشكرا دەبێت، بەڵام ئایا لە پشت مەرگەوە چی بەدی دەكرێ؟! نابێت لە پشت ئەمەوە پاڵنەر نەبێت، ئەم پاڵنەرەش لە هەموومان گەورەترە و هێزێكە بۆ ئەزموون و پێوەری ئێمە، كەواتە ڕوون دەبێتەوە ئەوەی ڕوح مانی هەڵگرتووە ڕێگەی فەنا بوون دەگرێ و نامێنێت، نەك- ڕوح- مان خۆی، لەبەر ئەوە جەستەمان دەچێتە ژێر خاك یاخود نامێنێت، بەڵام لای

خـودای گـەورە، ئـەوەی هێـزی مـەرگی ئێمـەی بەدەسـتە، ئـەو نهێنییەمان پێ نیشان دەدات بۆ ئەوەی هەرچی لە گەردوون هەن ببینین و لەسەر ئەم پەیامە بڕوامان پتەو بکەین، لەلایەکەوە لە ژیان هەرچی لە خۆشییەکان هەن بۆ ئادەمیزاد دانراون، کەواتە ئادەمیزاد دەتوانێ پێیان دا گوزەر بکات، بەڵام نیشانەی مەرگ و دوا چارەنووس بۆ ئەوەیە، بۆ هەموو مەسەلەکان بگەڕێنەوە و بڕوا بە پەیامی خەڵقندە و دروستکەر بهێنین، چونکە لە خۆوە نیە، ماسییەکان لە دەریا و ڕووبار، لە نێو ئاودا دەژین!!، لە خۆوە نیە باڵندەکان باڵیان گرتووە و بە ئاسماندا دەچین؟! لە خۆوە نیە کانیاوەکان دەتەقن!!! لەخۆوە نیە خاکەکان بەر دەدەن!! لە خۆوە نیە گوڵەکان بۆنی خۆش بڵاودەکەنەوە!!! لە خۆوە نیە درەختەکان بەر دەدەن!! لە خۆوە نیە ئاسمان باران دا دەکا!!! لە خۆوە نیە چاوەکان پڕن لە بینایی!! لە خۆوەنیە گوێیەکان دەبیستن!! لەخۆوە نیە هەستەوەرەکان دەگوازنەوە!!! لە خۆوە نیە قاچەکان هەنگاو دەنێن!!! لەخۆوە نیە سییەکان هەناسە دەدەن!!! لەخۆوە دڵەکان لە ترپەدان!! لەخۆوە نیە مرۆڤ خاوەن ئاوەز و هۆش و عەقڵە!!! گەر بپرسین ئەم هەموو سیفاتانە لە کوێوە هاتوون!!! دەشێ لەخۆوە هاتبن! بێگومان نەخێر!! چونکە هەرچی لە خانەی هەست پێکردن و بینین و زەین و مێشکمان دا هەن لەخۆوە نین، جا بەو ئاراستەیەی شتەکان لە بچووکترینیانەوە تاکو گەورەترینیان هەن، لەمەوە بیرکردنەوەی قووڵتر دێتەکایەوە، چونکە هەموو ئەمانە لە دایك دەبن و دەژین و پاشان دەمرن، بەڵام گەر لێی ووردبینەوە لەلایەکەوە جەستە ئامادەگی هەیە و

لەلایەکی ڕوح، ئەم هاوکێشەیەش هێندە ئاسان نیە، بۆئەوەی خۆمان لێ بێ بەری بکەین، بمانەوێ یا نەمانەوێ حەتمیەتی خۆی سەپاندووە، چونکە بوونی مەرگ ئەمەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، تاکو لە بابەت ئەوانەی نابینرێن بزانین چارەنووسیان چین!!!؟ مەگەر ئەمە پرسیارێکی زۆر ستەمە، بەلاّم ئەوەی زانست و مەعریفەی ئێمەی پێ دەگا لە خۆلیا و ئارەزووە سەرهەڵدەدا، بۆخۆی هەمان ئەو ڕێگایەیە کە بۆ سەرچاوەی تاك و تەنها دەگەڕێتەوە، لەمەوە دەپرسین- تەنها لەو چوار چێوەدا دەرفەتمان هەیە- روح- ڕەوان چی یە؟!!! چلۆن دێتە کایەوە؟!! لە کوێوە دێ و بۆ کوێ دەچێ؟!! ئایا جیهانی ڕوح- ڕەوان- چ تایبەتمەندی هەیە!!؟ بۆچی ناکەونە بەر جەستەی ئادەمیزاد؟!! جا ئەم پرسیارانە هەروا سادە و ساکار نین،ساڵەهایەکی ویستووە بۆ دەرککردنی، پاشان ئەو ئەنجامانەی لێ هاتوونەتە کایەوە، کە تیایدا ئەو هێڵە بەنهێنی و ئاشکرا دروست دەبێ بۆ ئەوەی هەست بە- سەرچاوە- ببێتە یەکەم مەسەلەی ئادەمیزاد، دەیەوێ لەوسەرچاوە شتەکان بناسێ و چەقێکی دەست کەوێ کە ئەم بەدی هێنەریەتی، نەك بکەوێتە جیهانێکی ناپەسند و دەرەوەی بەهاکان، دەیەوێ بزانێ لە کوێوە بەدی هاتووە!!؟ چ نهێنیەك لە ژیان دا هەیە؟!! بۆچی دەژی و ژیانی بەو تایبەتمەندییە بۆ دانراوە؟!! چۆن بەدی هاتووە و هاتۆتە کایەوە؟! بۆچی بەدی هاتووە؟!! ئایا ئەم بەدی هاتووانە بۆ کوێ دەڕۆن؟!! لەبەرچی ڕێڕەویان بەم جۆرەیە؟! ئایا ئەم بەدی هاتووانە سەرچاوەی هەموویان هەر یەکێکە؟!! یاخود هەر بەدی هاتوویەك بۆ خۆی

دروستكەر و سەرچاوەی خۆی هەیە؟!! ئایا دەکرێ ئەم بەدی هاتووانە سیفاتی گشتی یان لەیەك جودا بێ؟!! ئایا هەموو ئەم شتانە چۆن بە یەکەوە بەستراونەتەوە؟!! بۆچی بەو شێوانەی هەیانە هاتوونەتە ئاراوە؟! چۆن لەگەڵ یەکدا گونجاون؟!! بۆچی بەم جۆرە هەڵدەکەن؟! چەندە پرسیاری تر بەرەو مەنزڵگایەکەمان دەبەن، کە تیایدا خۆمان بناسین و لەسەرچاوەی سەرچاوەکان بگەین، بێ هۆ نیە خۆر ئەم گەرمی یە لە ڕادە بەدەرەی هەیە و وزە بە گۆی زەوی دەدا و ڕێکی دەخا!!! بێ هۆ نیە مانگ بەو جوانیەی هەیەتی تیشکی خۆر دەداتەوە و ڕێڕەوێکمان بۆ دادەنێ و ڕۆژەکان ڕێك دەخا؟!! بێ هۆ نیە ئەستێرەکان ڕۆژمان بۆ دەژمێرن و چەندەها نیشانەمان پێ دەدەن!!!.

ئادەمیزاد دوای ئەوەی هەموو قەوارەی بۆ تێگەیشتن لە دەوروبەر و دیاردەکان خستە کار و ویستی زیاتر بەنهێنی یان شارەزا بێت، بەدوای هەموو پرسیارەکان گەڕا، وە نەبێ وەڵامی ڕەهای دەست بکەوێ، بەڵام دەیوست ئەو شوێنەوارانە پێ بزانێ کە سنوورەکانیان بۆ ئاشکرا دەکەن، خۆیان پێناسە دەکەن، بۆ ئەوەیان دەبەن لە گەردوون بڕوانی و لە پشت بوونی گەردوونەوە سەیری هەموو شتێك بکات، چونکە سوڕ و بزاڤ و جولانەوەکان سەلمێنەری ڕاستی گەورەن و نیشاندەری حەقیقەتی ڕەهان، کە تیایدا لە یەك تاریفەوە خۆی دەدۆزێتەوە، ئەوەتا لە گەردووندا هەموو سیفاتەکان خۆیان دەخەنە پێشەوە، هەموو سیفاتەکان، هەموو ئاکارەکان خۆیان نیشان دەدا، مەگەر هەر ئەم ئاکارانەش بەدی دەکرێن، ئەگینا دەریاکان چۆن بە مانگ کاریگەر دەبن!!!

خۆر چۆن تیشکەکانی دەخاتە سەر زەوی!!! چۆن ئاسمان ڕەنگ هەڵدەگرێ!!! ئەمانە بەر لە مرۆڤ هاتوونەتە کایەوە، مرۆڤ ساتێ سەیری خۆرهەڵاتن و خۆرنشینی کرد" کاتێ مانگی بینی بەپێی زەمەنی خۆیان، ساتێ لە پرشەنگ و جوانی ئەستێرەکان ڕاما، لە سروشت جوانیەکانی دی، لە سروشت ترس و لەرزی دی، ئازار و ئەشکەنجەی دی، ئەمانە بێگومان ڕوو بەڕووی بوونەوە، بۆ ئەوەی هەرچی هەیەتی بخاتەکار، دەبێ دوور لەمانە چی بەدی بهێنرێ؟!! بە دڵنیاییەوە ئەمەی دوور خستەوە، چونکە دوور لەمانە ژیان مەحاڵ دەبوو!!! ئینجا کەوتە چەقی پرسیارەکان، بەو پێیەی خاوەن هەست و نەست و عەقڵ و خولیا و لێکدانەوەیە، لە پرسیارەکان ڕاما و تێڕوانین و ڕوانگەی هەڵێنجا بۆ ئەوەی نزیک بێتەوە لە وەڵامەکان، یاخود لە دەروازەی وەڵامەکان حەقیقەتی ڕەها بناسێ، ئەوەش پەیوەندییەکە ناچێتە خانەی تەواوی وەڵامەکان، لەلایەکی ترەوە وەڵامەکان خەسڵەتی مەحاڵی هەڵدەگرن، ئەم هاوکێشەی پرسیارو وەڵامە، تێزێکی تایبەتی یە لەم بابەتەدا، چونکە پرسیارەکانی گەلێ زۆرن، گەلێ ئاست لەخۆ دەگرن، لەناو پرسیارەکان دا ڕەگەزی سەرسامی باڵا دەستی دەنوێنێ، بەڵام لەناو وەڵامەکان دا تووشی تەمومژ دەبین، ئاستەکان لەگەڵ ئەوەی زۆرن، بەڵام دانەوەیان مەرج نین، بەڵام لەم نێوەندەدا لە مێشکی ئێمەدا شوێنێك داگیر دەکەن و بەرەو ڕێگای (سەرچاوەکان) ئینجا بۆ (سەرچاوەی سەرچاوەکان) هەنگاو هەڵدەگرێ، کە بۆ خۆی لە سروشتدا لە گەردوون دا هێزەکان هەبن!! دەبێ لە کوێوە هاتبن؟!! جا چلۆن ئەم جوانیانە هەن؟!!

جا چۆن نەترسیٚ کە ئەم هەموو هێزانەی بەدەستە؟!! چۆن ئەم مەترسییانەی هێناوەتەکایەوە؟!! جا دەبیٚ هەر من هەبم یاخود هی تریش هەبیٚ؟!! دەبیٚ بەدیهێنەری ئەم ژیان و گیان و مەترسی و بارودۆخانە کیٚ بیٚ؟! ئایا ئەم هێزە گەورەیە چۆن لێی نزیك دەبینەوە؟!! نزیك بوونەوە لێی بە چ جۆرە خۆشەویستییەك بەدی دێت؟! دەبیٚ من بە چ شێوەییٚ ببمە خۆشەویستی و مەحەببەت پەیدا بکەم؟!! بە چ شێوەییٚ لە (خـۆمی لیٚ) ڕازی بکەم؟!! ئایا پەسەندەکان چین و ناپەسەندەکان چین؟!! چی بەلایەوە چاکە و چی بەلایەوە خراپە؟!! چۆنی بەدی کەم؟!! چۆن ڕووناکییەکان بدۆزمەوە و لە کویٚ دا بەرەو تروسکاییەکان بچم؟!! ئەی خۆزگەکان چین؟!! بێگومان خۆزگە هەمیشەییەکان.

دەکریٚ ئەو جیهانە بدۆزتەوە تیایدا تا ئەو پەڕ خۆم بپارێزم؟! تا ئەو پەڕ لە مەرگ دوور بکەومەوە؟!! تا ئەو پەڕ مەرگ نەناسم؟!! دەکریٚ لەم نێوەندەدا بە گیانم ئاسوودەبم؟!! ئەی ئەگەر لەم نێوەندەدا مەحەببەت هەبیٚ" دەبیٚ بەسەر کۆسپەکان زاڵ بم؟!! لە ژیان دا چی لەسەر من پێویستە؟!!.

بێگومان ئەم پرسیارانە بەرەو سەرچاوەیەکی گرنگمان دەبەن، بۆ ئەوەی لە هەموو شتەکان دا شتێك بناسین، بۆئەوەی بەوەی لە قەوارەمان هەیە هەموو مەسەلەکان بدۆزینەوە، چ عەقڵ، چ لێکدانەوە، چ ڕوانگە، تاکو ڕاستەقینەی ئیمانمان بۆ دەرکەویٚ، و لەسەر پێگەی ئیمانەوە ڕوانینمان بچەسپێنین، تاکو لەم پرسیارە هەمیشەییانە خودی خۆمان بناسین!! ئامانجەکان بەدەر بخەین، لەمەوە ڕۆچوون بەرەو ناوەوەی مرۆڤ و ناسینەوەی ئەم جیهانە،

له کاتێکا مرۆڤ پێی ئاشنا بووه، توانیویەتی بیکاتە مەنزڵگایەکی گرنگ وەك پێوەرێك گەلێ مەسەلەی تیایدا چارەسەر کردووه، بەجۆری قەوارەی خۆی پاراستووه له هەنگاوی یەکەمدا، ئینجا له هەنگاوەکانی تردا له ڕێگەی (ڕۆشەن بوونەوه) و درك کردن به نهێنیەکان، واته له شوێنێکدا سەیری ژیان دەکا که پاکترین شوێنه له هەموو سات و کاتێکدا، بەهۆی ئەم پرسیارانەوه دەگەینه یەکەم ڕەگی تەسەووف، ئەمەش بناغەیەکه بۆ تەسەووف، لەمەوه دەزانین ڕەگەکانی له سروشت له کوێدا هەن!!.

وەك دەزانین بیرمەند و لێکۆڵەران له زووەوه گوزارشتیان له ژیان کردووه، لێرەوه دوو چەمك دێنه ئاراوه، ئەویش خودی گوزارشت، ئەوی تریش گوزارشت لێ کەر، به واتا ئەو شوێنەی گوزارشتەکەی هێناوەته ئاراوه، لەمەوه دەگەینه ئەم ئەنجامەی چەندان ئەوانەی کاریگەرن بۆ ئەوەی گوزارشت بێته ئاراوه، بێگومان مەبەست له گوزارشت به شێوەیەکی گشتی هەموو ئەو بەرهەمانەن که مرۆڤ له ڕووی مەعنەوییەوه دەری بڕیوه، لەبەر ئەوه له قەوارەی مرۆڤدا "عەقڵ"و"عاتیفە"و"ئالۆش"و"هێز"و "ئیرادە"و"خود"و"ئیمان"و"ڕوانگە"و"بۆچوون"و"یەقین".. هتد هەن، بۆیه کاتێ ئەمانه لەگەڵ دەوروبەری لەگەڵ سروشتدا لەگەڵ کەمەڵگا کارلێکیان کرد، بەم هۆیەوه گوزارشتەکان دێنەکایەوه، جا ئەم هاوکێشەیه، وەك چەسپاوێك لەگەڵ ئەوەی پرسیارەکان بەرهەم دێنێ، هەروەها له ڕوویەکی تردا بەدوای وەڵامەکان دەگەڕێ، خودی ئەم ڕستەیه گەورەترین حیکمەتمان پێشکەش دەکا و بەرەو جیهانێکی پاکمان دەبا، ئەویش (بڕوا بوون)ه،

بەواتا (ئیمان) ئەو شوێنەی بە بنیادنانی گەورە بەناوبانگە، چونکە هەموو پێگەکانی تر لەسەری وەستاوە، ئەمەش پێناسێکی گشتی یە کە یەکێك لە پێگەکانی تەسەووفە.

بەو پێیە ئەم هاوکێشەیە لە ڕێگەی (عەقڵ) و ئەوەی لە قەوارەمان دا هەیە و بەرهەم هێنە و دەتوانیٚ بەم ئاواتە بگا کە (بەدیهێنەر) تاقە (بەدیهێنەرێك) (خەلقندە)ی ئەم جیهانە بناسیٚ، (بەمانەش ئەڵێن: فەیلەسوفەکان) بەلاٚم ئەو دەستەی دوهەمە لەگەڵ هەموو زانیاریەکیان تا ئێستەش هەر بە مراز نەگەیشتونو هەر سەرگەردانن وە هەریەکەی ئەوەی پێشوو بە درۆ ئەخاتەوە" وە تاوەکو ئێستا نەیانتوانیوە ڕێگاییێکی زانیاری بۆ ناسینی خاوەنی جیهان بدۆزنەوە.... جا ئەم هەوڵو تێکۆشانە بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی سەرچاوەکان وە هەڵسوڕێنەری کاروباری گەردوون و گیانداران.

وە هەوڵ و تەقەلادان بۆ خۆ نزیك کردنەوە لەم سەرچاوەیەوە ئەنجام دانی هەرشتێك کە ئەو پێی خۆش بێت، وە دەس لە هەموو شت و هەموو کەسیٚ هەڵگرتن.

تا ئەو کاتەی کە بە تەواوی بەو مرازە بگەن و لەو هێزە تێگەن و لە خۆیانی ڕازی کەن، وە پشت بەو زیاتر پشت بە کەس نەبەستن، وە هەوڵ بۆ دڵنیا بوون لە بوون و لە چۆنیەتی ئەو هێزە" بریتیە لە (تەسەووف) کەوابو هیچ درۆ نیە ئەگەر بڵێین (تەسەووف) لەسەرەتای هاتنی مرۆڤەوە لەسەرەتای بەدی هاتنی ئاوەز و ژیری یەوە هەر بووە، چونکە هەموو بریتی یە لە شەیدا بوون بە شوێنی سەرچاوەی سەرچاوەکان و بەشوێنی

هەڵسوڕێنەری نەناسراوی ئەم گەردوونەدا، وە تێکۆشانە بۆ ناسینی ئەو دیوی هەمووی ئەم شتانە کە ئەیان بینین لە گیاندار و بێ گیان، بۆچی؟ بۆ تێگەیشتن بە باوەڕی تەواو واتە بە (یەقین) بە ئارامی دڵ و گیان[1].

ئەم تێکۆشانەش ئەگەر بەهۆی باوەڕەوە چەسپاو نەبێت، بێگومان بێ پەروا و بێ سەنتەر دەمێنێتەوە و بێ ئامانج دەبێ و هەروەها خۆشی ناناسێتەوە، لەبەر ئەوە ون دەبێت و سەرەڕای ئەوەی وەك ڕێبازێك خۆی نامێنێ، بەڵكو پووکانەوە دەبێ لە پێناو ناوەوەی مرۆڤدا، جگە لەوەی وەك ئارەزوویێك، وەك خولیایەك دێتە پێشەوە، یا ئەوەتا لە پێناو ئامانجێکی ناپەسەند و زشت بەکار دەهێنرێ، ئەمەش لەلایەکەوە لەسەرچاوەوە هەڵئەقوڵاوە و لەلایەکی تریش پێکهاتەی تەواوی نیە و سەرەڕای ئەوەی ئامانجیشی نادیارە، لەبەر ئەوە دەچێتە خانەی فریودان، لەگەڵ ئەوەش بەتەواوی لە مەغزای خۆی تێر نەبووە، بەڵکو لە هەموو ئەمانەدا بەشێکی وەرگرتووە و بۆ ئەوە هاتۆتە کایەوە کە مرۆڤ بخاتە سەرگەردانی و لە شوێنە پاکەکان دووری خاتەوە، بەڵام هەرچی تەسەووفی ئیسلامی یە، لەگەڵ حیکمەت هەڵنراوە و گەڵ خاسڵەتی لە خۆگرتووە، بەر لە هەر شتێ تەسەووف تێکۆشانە، دەشێ بپرسین ئایا چ شتێك هەیە هێندە لە مەرگ دا خۆی تێ بەرێنێ؟!! ئەم پرسیارە لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دوو ڕووکاری هەیە، ئەوەتا خودی تەسەووف لە ڕووکاری یەکەمدا ئەوەی

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ل٣٩.

درکاندووه که مەرگ هەیە، ئیدی لە خوار ئەمە یاخود لەم نێوەندەدا ژیان هەیە، کەواتە ژیان کاتی یە، بۆیە بەدوای ئەم هاوکێشەیە تەسەووف بۆ هەمیشەیی و لە ڕادەبەدەر دەگەڕێ، دەیەوێ بەچاوی (یەقین) بڕوانێ، ئەوەی لە دڵدا هەیە یەکسەر بە ڕوانگەی ببەستێتەوە، هەرچی ڕووکاری دووەمیانە دوای ئەوەی ئەم هاوکێشەیەی دۆزیەوە هەوڵ دەدا جەمسەرەکان پڕ بکاتەوە، تاکو لەم ناوەندە تێ پەڕێنێ، بۆ ئەوەی هەمیشەیی دەستەبەر بکات.

گەر لەم پرسیارانە لە مرۆڤ بڕوانین، سەرنجی ئەوەدەدەین تەسەووف بەهەر شێوەیێ بووبێت لەگەڵ مرۆڤ و مێژووەکەی و بگرە ڕەگی بۆ زۆر دوور کشاوە و هەبووە، جا ڕەنگە ئەم گوزارشتانەی لە بابەتی دیکە دا ڕەنگی دابێتەوە، بەڵام ئیدی هەر بابەتێك بووبێت، گوزارشت نەگۆڕ بووە و ناوەندێتی خۆی لەدەست نەداوە، لەسەرێکی ترەوە ئەم بابەتە پەیوەستە بە ڕوح ی مرۆڤ، ئەمەش وەك بابەتێکی فرەوان و هەمیشەیی مامەڵەی لەگەڵ کراوە، تاکو لەگەڵ جەستەدا جیاوازی بکەین و بزانین چۆن گوزارشتیان لێ کراوە و جەستە و ڕوح چ جیاوازییەکیان هەیە، لەم بارەوە لە زووەوە تەسەووف بیروڕوای خۆی ڕاڤە کردووە و چووەتە قووڵایی ڕوحی مرۆڤایەتی و لەوێدا هەموو بەهاکان بنیاد دەنێ، و پێگەیان بۆ دروست دەکا، بۆ ئەوەی سەرجەم بەها بچووکەکانی تر لە کۆمەڵگا بکەنە ئاسوودەیی و خۆشبەختی و بەختەوەری نەمر.

دەشێ ڕوح و جەستە لەو مێژووە دوور و درێژەی هەیانە بەردەوام ناکۆك بن، بەڵام ئەمە کاری ئێمە نیە بۆ لەگەڵ یەکدا دەژین و ئەمەیان بە چارەنووس بۆ براوەتەوە!!! تەسەووف ئەم

گرفتەی چارەسەر کردووە، هێندە جەستەی هیلاك کردووە، بۆ ئەوەی بە هەموو مەسەلەیێ ڕازی بێت، ڕوحیش هەڵوەدای ئەوپەڕی بەرزێتی یە و ڕەنگە نەگا بەوەی ڕەسمی کێشاوە!! لە پێناو ئەوەی ڕەسمی بۆ کێشاوە گەڵێ بەدبەختی و مەرگەسات دەبینێ، مەرگەساتێك بەمانای وشە مەرگەسات، لەو ساتەوە هەموو قەوارەی لەبەین دەچێ و جەستە بەرەو هەڵدێر دەبا، بەڵام تەسەووف لە پێناسە پاکەکانەوە ڕوح و جەستە ڕۆشن دەکاتەوە، دەچێتە ئەو باڵاخانەی تاکو لە خالقی ئەمانە نزیك بێتەوە، ئەمەش بەسەرەوەی هاوکێشەی ڕوح و جەستەیە، چونکە ئەمانە بۆ خۆیان دروستکراون.

ڕەنگە لە زۆربەی کەلتورەکان کاتێ سەرنج هەڵدەگرین بۆ ئەوەی بە تەواوی هەندێ لە زاراوەکان شی بکەینەوە، بێگومان لەم بارەوە ڕوو بە ڕووی شێوە و ناوەڕۆك دەبینەوە، ئەمە وەنەبێ لە دوو بەشی (ظاهر و باطن) پێك هاتبێ، بەڵکو لە سەردەمێکدا مامەڵە لەگەڵ هەندێ دیاردە دەکا بۆ ئەوەی لە کات و شوێنی تایبەتدا بیانناسێ، چونکە دیاردەکان چ شێوە و چ ناوەڕۆك لە خۆ دەگرن، بە تایبەتی ئەگەر ئەمە لە کۆمەڵگادا ڕاڤە بکەین، لەمەوە بپرسین وەك ڕەگێکی کۆمەڵایەتی لە تەسەووف دا ئایا لەم بارەوە لەگەڵ شێوە و ناوەڕۆك لە کوێدا دەکەوێتەوە؟!! گەر لە تەسەووف بڕوانین ڕەنگە سەرەتا بە هەڵە بچین نەوەك ئەم هاوکێشەی شێوە و ناوەڕۆك لێی نەکەوێتەوە، بێگومان گەر بە ووردی سەرنج بدەین: تەسەووف تێکەڵ بوونی شێوە و ناوەڕۆکە، بە واتا لە شێوەکاندا ناوەڕۆك بەدی دەکرێ و هەروا لە ناوەڕۆکدا

شێوەکان بەدی دەکرێ، لەمەوە ڕەوشتێکمان بۆ ئاشکرا دەبێ، کە قەوارەی تەسەووف یەکگرتن و یەکبوونێکی لە جۆرێکی (لە جۆری) مەتین تێدا دەست دەکەوێ، ڕەنگە بەراودکردنی ئەم دیاردەیە لەگەڵ دیاردەی تردا ستەم بێ، بە واتا دەستمان نەکەوێ، ل بنەڕەتدا ئەم هاوکێشەیە بۆ دیاردەکان دۆزراوەتەوە ئیدی ئەم سەرنجەش بۆ تەسەووف جیهانێك ئاشکرا دەکا، لە باریدا ئەمەیە دەیەوێ بەرەو (ڕەها) هەنگاو هەڵێنێ و هەرچی لە بتە دردۆنگییەکان هەیە تەفروتونای بکا.

بەو پێیەی بۆ لێکۆڵینەوەی تەسەووف و لەم پێناوەدا دوو بار دەست نیشان دەکرێ ئەویش خودی لێکۆڵەر و هەروا لێکۆڵینەوە، لەبەرامبەر ئەمەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە لیکۆڵەر دەبێ بابەتەکان دەست نیشان بکا و ڕاڤەیان بکا و هەڵیانبژێری، هەروا لێکۆڵینەوە پابەند دەبێ بە باری (زەمەن و شوێن)، جا تەسەووف وەك بابەتێکی فرەوان کاتێ لێکۆڵەر دەگاتە ناوەڕاستی ئەو هەستەی لا پەیدا دەبێ کە تێربووە، کەچی لە ڕاستیدا تێربوون مەحاڵە لەم بابەتە، بۆیە چەمکی (زەمەن و شوێن) دیاری ناکرێن، بەڵکو زیاتر درێژە بەخۆیان دەدەن و بەردەوام لەم ڕێچکەوە سەر هەڵدەدەنەوە، هەر چەندە ئێمە دەزانین لە کوێدا سەرەتای هەیە، بەڵام کۆتایی ستەم دەبێت چونکە خودی بابەتەکە زاڵ دەبێت کە ئەویش تەسەووفە.

لێرەوە درك کردن بە مەسەلە گرنگەکان شوێنی خۆی گرتووە، چونکە گوزارشتەکان بەهەر شێوەیەك بووبێ لەسەرەتاوە کە مرۆڤ سروشتی ناسیوە هەبوون، ئینجا بەهەر جۆرێ بەر جەستە بووبێ

(جا ئەم مەشرەبو هەستی بیرکردنەوەی سەرەتایی یە کە لە سەرەتای بوونی ئادەمی زادەوە ئەبیٚ هەر بوبیٚ، بە مەرجیٚك ئەتوانین ئەمە بەسەرچاوەی تەسەووف دابنیٚین کە تەسەووف تەنها پەیوەندی بەیەك دەستە، یان یەك چین لە مرۆڤەوە هەبیٚت، یان لە قۆناغیٚکی تایبەتی ژیانا، وە لەیەك شویٚنی ئەم جیهانەدا هاتبیٚتە دی).

وە لە هەمووی گرنگ تر، ئەگەر داخواز و ئاواتەکانی (تەسەووفی ئیسلامی)ش هەر ئەمانەبیٚ، وە تەنانەت هەموو مرۆڤە گەورە بەناو بانگەکانی تەسەووفی ئیسلامی، خۆیان واتای تەسەووفیان هەروەك یەك لیٚکدابیٚتەوە، وەکو بۆ نموونە، کە لەبارەی یاسای ئیسلامەوە، کە سەبارەت بە ئیمان ریٚکو راست ئەڵیٚ چی یە، وە سەبارەت بە ئیسلامیش هەروا، وە لە هەر مەلا و خویٚنەواریٚکی ئایینی بپرسیت ئیمان چی یە؟ خیٚرا وەڵامت ئەداتەوە: باوەر بە خوا و پیٚغەمبەران، بە مەلائیکان، بە کتیٚبە ئاسمانیەکان، بە رۆژی زیندوو بوون، وە موقەددەر، هەروا سەبارەت بە ئیسلامیش (شەهادەت هیٚنان بە تاك و تەنهایی خوا و بە پیٚغەمبەر(ﷺ) وە نویٚژ کردن و زەکاتدان و رۆژوو گرتن و چوون بۆ حەج گەر توانای ریٚگەت هەبیٚ)، بەلاٚم تەسەووفی ئیسلامی چونکە مەبەستیٚکی (تامو مەزەکردنی) رۆحی یەوە برِیٚ شیٚواز و ریٚچکەیە کە هەرچەن دواکەشی هەمووی هەر بگاتەوە بە یەك وەك بلٚیٚین بگاتە دوا پلەی نزیکی لە خوا و هەست بە تەواوی باوەرەوە (حق اليقين) یان (عين اليقين) یان بلٚیٚین: (بەقای پاش فەنا) هەستی پاش نیستی، لەگەڵ ئەوەشا هەر باغەوانیٚك سەبارەت بە میوەی باغەکەی خۆی باس ئەکاتو، هەر گوڵیٚکیان بۆنی تایبەتی خۆی ئەدا بە لووتمانا و هەر سەرچاوەییٚکیان تامومەزەی گەوارای خۆی ئەدا لە چەشتگەمان[1].

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ل٤٠ – ٤١.

تەسەووف دۆزینەوەی ڕێگەکەی بیّ بوونی ئایینی ئیسلام کەم و ناتەواو و نەبوون دەردەچیّ، چونکە ئەو (سەرچاوەی سەرچاوانە) خۆی بەدیهێنەریەتی، چلۆن بیّ ئەو شتەکان مەیسەر دەبن!!! لەلایەکی ترەوە لەتەوەری ئەو چاکە و پەسەندی یە دەردەچیّ کە لە ئیمانی ڕاستەقینەوە ڕەسمی بۆ کێشراوە و پێی دەناسرێتەوە، ئەمەش لەسەرێکی ترەوە ئەو پێناسەمان بەدەستەوە دەدات، کە تەسەووفی ئیسلامی تەنها ئایینی پیرۆزی ئیسلام موڵکیەتی (خاوەنیەتی) با لە سروشتی دا هەندیّ لایەنی دەرکەویّ و لە ڕوانگە و بیرو بۆچوون و گوزارشتەکانی دەرەوەی ئاینی ئیسلام هەبن، لە کاتێکا کە هەن بێگومان پەرش بلاّون، مەبەستمان فریودانە، بیّ بەرنامەن، لە پێناو بۆشاییەك هاتوونەتە ئاراوە، بەم شێوەیە هەن.

دوای ئەو سەقفەی تەسەووف هەیەتی، یەکیّ لە پرسیارەکان ئەوەیە، ئایا هەڵوێستی تەسەووف چی یە کە دەگوتریّ هەر لۆژیك- منطق- دونیا بەڕێوە دەبا؟!! تەسەووف پێمان دەڵیّ لە ژێر سایەی خودای گەورەوە گەلیّ نهێنی هەن، کە مرۆۃ زۆر کەمیان لیّ دەزانیّ، ڕەنگە لە دڵۆپێك کەمتریان لیّ بزانیّ، لەمەوە تەسەووف دان نانە بەوەی کە دونیا هەر لۆژیك بەڕێوەی نابا، جا ئەگەر لەسەر ئاستی هەر چی زانستەکانیش بێتە ئاراوە تەسەووف دەچێتە ئەو کەلێنە ئەستەمەی نێوان عەقلّ و لۆژیك، گومان لەوە نیە لۆژیك لە تەواوی هێڵەکەی دا سەرەتا و کۆتایی بە دڵنیایی دەست پیّ دەکا و هاوکات هێڵی تر هەن کە دوورن لە دڵنیایی، کەچی تەسەووف لە تەواوی هێڵەکەی دا (یەقین) هەن و

بەرەو ئەم جیهانە هەنگاو دەنێ و هێڵی تر لە تەکیەوە بەدی ناکرێ، چونکە هەر زوو گومان و دوو دڵی و دڕ دۆنگی فڕێ دەداتە سنورێك کە توانای جولەیان نەبێت، بەڵام لە نێو کۆمەڵگا و مامەڵەی تر ئەمانە دەکەونە جووله و چالاکی دەنوێنن، لەبەر ئەوە لۆژیك و تەسەووف مەسەلەی (دڵنیایی) و (یەقین) دەخەنە بەرباس لە ساتێکا لە لۆژیك (دڵنیاییەکان) کاتین، کەچی (یەقین) هەمیشەیی یە (دڵنیاییەکان) دەشێ بگۆڕین، بە واتا چەسپاونین، کەچی (یەقین) نەگۆڕە (دڵنیاییەکان) پێگەیان لەرزۆکە، کەچی (یەقین) پێگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامە، چونکە ڕوونە تەسەووف لە خۆوە نەهاتووە و بۆ ساتێکی دیاریکراو، بەڵکو بوونی بە چارەنووسەکان پابەندە، ئەگەر لەهەر جۆر و شێوازێك بێت لە هەر چ سەردەمێکدا، چوونی کاکڵەی (یەقین) بەواتا فرەوانەکەی مەبەست و مەغزاییێکی گرنگ پێکدێنێ، کە خۆی لە خۆی دا سوڕێکی مەزنی دروست کردووە بۆ ئەوەی ڕازە گەورەکان پەی پێ ببەین، ئەویش کە قەوارەی مرۆڤ بەرەو (یەقین) دەچێ.

لە تەك ئەمانەوە تێزێکی تر سەر دەردێنێ، دوای لێ وورد بوونەوە ڕامان و چوونە نێو جیهانی تەسەووفەوە" ئایا ئەم زانستەی کە بە (علم التصوف) ناسراوە لەخۆوە سەری هەڵداوە؟! ئایا بە حەزی چەند کەسانێك هاتۆتە گۆڕەپانەوە؟!! لە ڕاستیدا چ جاری لە پێناو تەسەووف دا کە تێزە سەرەتاییەکان ڕوونکراونەتەوە و پاشان بە خودی ئیمانی ڕاستەقینەوە بەستراونەتەوە، ئەوا لەلایەکی ترەوە پەرەسەندنی تەسەووف و مێژووەکەی شایەتی ئەوە دەدەن، تاقە سەرچاوەیەك تەسەووف

لێـی هاتبێتـە کایـەوە قورئـانی پـیرۆزە، و هـەرگیز تەسـەووف لـە قورئانی پیرۆز دەرناچێ، کەواتـە لـە خـودی کۆمـەڵگای ئیسـلامەوە سـەری دەرهێنـاوە، وە نـەبێ بـارێکی دەرەوە دروسـتی کردبێـت و ڕۆڵـی لــە دروســتبوونی هــەبێت، چــونکە زۆربــەی چــەمکەکانی تەسـەووف لای پیـاوە گـەورەکان و ئـەولیاکان تایبـەتن بـە خۆیـان، هەرچـەندە مەسـەلەی دیکـە لـە دەرەوەی ئـەم کۆمەڵگایـە هـەبێت، ئەمــەش گفتوگۆیــەکی زۆری دروســت کــردووە، بــەڵام ســاتی ســەرهەڵدانی تەســەووف و نەشــونمای و ڕێچــکەکەی هاوتەبایــە لەگــەڵ کۆمــەڵگای ئیســلام و لەسەرچــاوەکان کــە باســیان لــە تەســەووف کــردووە، ئەمــە بــەدی نــاکرێ لەبــەر ئــەوە بزاڤێکــی خۆڕسك لە تەسـەووف دا هەیـە، لەگـەڵ پـەیامی پیرۆزی ئیسـلام دا چەمکەکان هاتنە ناوەوە، دیارە ئـەوکات پێویسـت بـەوە نـەبوو ئـەم چـەمکەکانە لـەو خولـەدا بسوڕێنەوە، بۆیـە بـاری بابـەتی و خـودی نـەبووە، کەچـی کـاتێ کـە پـەرەی سـەندووە قۆناغێك هـەبووە بۆیـە پەرەســەندی چــەمکەکان، پاشــان یــەکگرتنیان و کارکردنیــان لــە پێناو ئەحکامـەکانی پەرستش دا، کە تیایـدا لـە چەند لایەکەوە کار بکــات چ بــۆ تێکۆشــان لــەناوەوە بــۆ ئاڕاســتەکردنی کۆمــەڵگا بەشێوەیەکی گشتی چ بۆ بابـەتی زانسـتی و لێکدانـەوەکان چ لـەوەدا کە خودی پرسیارەکان مەزنترن لە وەڵامەکان و چەندەها تێزی دیکە.

ڕێگەی ناسینی خودا بەهۆی تەسەووفەوە خستراوەتە کۆمـەڵێ ئەحکام و ڕێسا و یاسای بۆ دانراوە، هیچیان لـە خـۆوە نـەهاتوون، بەڵکو لە قورئانی پیرۆز سەرچاوەیان گرتـووە و توانیویـەتی خـۆی ڕوون بکاتەوە و هەڵوێستەکان دەست نیشان بکا لـە پێنـاو ئـەوەی

لە شەریعەت بۆ تەریقەت بۆ حەقیقەت هەنگاو بنیٚ، بەو پێیە ڕوونە لە ئاستی یەکەمدا شەریعەت سنوور و چوار چێوەی تەریقەت و حەقیقەت دەست نیشان دەکا، ئینجا لە تەریقەت دا ڕەوشەکە دەست پیٚ دەکا بەرەو حەقیقەت هەنگاو دەنیٚ، بۆ ئەوەی بگات بە پلەکانی باوەڕ لە (علم اليقين) و(عين اليقين) و(حق اليقين) بۆئەوەی سەراپا جەستەی مرۆڤ تەنها (یەقین) بێت و هەموو ئەندامانی گوزارشت لەمە بکەن، چونکە گەوهەری تەسەووف لە ئەزموونی ناوەوەدایە، ئەم بنەمایەش سەراپا مێژووی تەسەووفی لە خۆگرتووە و تایبەتە بە خۆی، بەواتا لەناو خۆی دا ڕەگەزە پەرەسەندووەکان بەرهەم دێنیٚ، کە لەسەر لۆژیك بنیاد نەنراوە، بەڵکو زۆر جیاوازی بەدەستەوە دەدات، ئینجا هەر لەم ئەزموونەوە، دەیەویٚ لە پێناو خودای گەورەدا هەنگاو هەڵێنیٚ بۆی، بەواتا پلە بە پلە بە پایە بە پایە ببڕیٚ تاکو بگاتە ئەو ڕەوشەنی و تیشکە حەقیقەتەی کە سەرچاوەی هەموو حەقیقەتێکە، بۆیە ئادەمیزاد لە چەشەی ئەم حاڵەتە دەکەوێتە بارێکی ڕاستەقینە و هەموو جەستەی یەك کارکرد بەڕێوەیان دەبات لە پێناو گەیشتن بەخودای گەورە، دەبیٚ ئەوەشمان لەبیر نەچێت (سۆفی) کە دێتە ئەم جیهانە پاکە سەرەتایەکی هەیە، لەمەوە پێڕەوەکان دەست پیٚ دەکا وەك ڕێبوارێك کە بۆ سەفەر دەچیٚ، بەلاٚم ئەو سەفەرە ئاسایی یە نیە کە بۆ شوێنێکی تایبەت و لە زەمنێکی دیاریکرا و ئەنجام دەدریٚ، بەڵکو ئەو شوێنەی سەفەری بۆی کردووە، هەوڵ و تێکۆشانی ناوەکی دەویٚ بۆ گەیشتن پێی، جا (السالك، المريد) ئەمانە (المسافر)ن کە سەفەر بەرەو خودای گەورەیە، دەبیٚ بە

مەقام و حاڵەکان دەستی پێ بکا، کەواتە (سۆفی) خۆی خۆی خزمەت دەکا، خۆی چارەسەری خۆی دەکا، لەسەر (خودی) خۆی دروست دەبێتەوە، بەرەو قوڵاییەکان هەڵدەکێشێ، لەناو دەروونی خۆی وا تێکۆشان دەست پێ دەکا، هەتاکو دەروونی ببێتە پاکترین شوێن نەوەك گومان لە کار هەبێ، بەڵکو نەفی ئەوەش دەکاتەوە و تەنها (یەقین) تیایدا گوزەر دەکا، بەجۆرێ دڵەکان پاك دەکاتەوە، هیچ شتێ زەفەری پێ نەبات، دڵەکان دەبنە قەڵایەك لە پێناو کردارە پەسەندەکان کە لە پێناسە پەسەندەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە، پاشان لە دڵەکان هەموو جەستە هەمان پێناسە وەردەگرێ و پاکژ دەبێتەوە، لەمەوە ئادەمیزاد هەموو سەرچاوەکان دەناسێ کە لە یەك سەرچاوە هاتوون ئەویش (سەرچاوەی سەرچاوەکان)ە لە چەمکێك دا سۆفی هەنگاو بەرەو (سەرچاوەی سەرچاوەکان) هەڵدەنێ و پشت لەسەرچاوەکان دەکا، لە دەوروبەری دا هەموو شتێ بەچاوی دەبینێ کە تیایدا سەرچاوەی بوونی هەیە، ئەم چەمکەش بێگومان ڕەهایە و خۆی لە حەقیقەت دەدۆزێتەوە، (سۆفی) بەرە بەرە دەچێتە مەقام و حاڵەکان دەبینێ، هەتاکو لە کۆتاییدا دەگات بە (زاتی بەرز).

ئەم ڕێگەیەش هێندە ئاسان نیە، سەفەرێکی کورت نیە، بگرە تەمەنێکی دەوێ، ڕەنگە زیاتر لە تەمەنێکی بوێ، بەڵام ئەوەی (سەرچاوەی سەرچاوەکان)ە خۆی لە (یەقین) و (ڕەها) و (مەزنێتی) و چەندەها پێناسی تر دەنوێنێ.

## له بارەی وشەی ( سۆفی ) یەوە

لێکۆڵینـەوە لـە بابـەت تەسـەووفەوە هێنـدە ئاسـان نیـە، وەك دەریـش کـەوتووە، نـاتوانرێ بـە میتـۆد و ڕێبـازێکی ڕوون لێـی بتوێژیـەوە، ئەمـەش لەلایەکـەوە خـودی بابـەتی تەسـەووف لەبـەر ئەوەی (ئەزمونێکی زاتی)یـە و تایبەتـە بە خۆیان، چونکە دەریان خسـتووە، نووسـین لـە بارەیـەوە ناگاتـە ئاسـتی چـوونە نـاوی، ئـەوەش خـاڵێکی یەکلاکەرەوەیـە و گومـان لـەوە نیـە بـۆ گـەلێ مەسـەلەی تـر دەکێشـێ و خـۆی پێنـاس دەکاتـەوە، لەلایـەکی تریشەوە تەسەووف زۆربەی ئەو بارانـەی ئەو حاڵەتانـەی پـەلی بـۆ هاویشـتووە گـەلێ زۆرن بەشـێوەیەکیش کەوتۆتـەوە و پـەرەی سـەندووە، کـۆنترۆڵکردن و چـاودێریکردنی دەبـێ لـە میانـەی بەرنامەیـەکی ڕێك و پێك و پوخـت دابـێ، کـە کاتێکی زۆر و درێـژ خایەنی دەوێ، ئەمەش لـە تاقـەتی کەسێك دا نیـە، لەگەڵ ئـەوەش دەبیـنین دوای ئـەوەی تەسـەووف کەلـەپورێکی دێـرین و مـەزنی پێکهێنا، لێکۆڵەران لە حاڵی حازریش دا زۆر بیروڕای جودا جودا یـان لـەبارەوە هەیـە، هـەتا ئـەم دواییـەش کـە ڕۆژهەڵاتناسـان لـە تەسەووفیان کۆڵییەوە، پەی یان برد وەك زانستی ئامادەگی هەیە، زۆر بـیرو بۆچـوونی دیکـەیان خسـتە نـاوەوە، لـەبارەی ڕۆژهەڵاتناسان گەلێ گرفت هەیە، کە دەبێ باسێکی سەربەخۆی بۆ تەرخان بکرێ و لێی وورد بینـەوە، هـەروەها دەبـێ ئـەوەش بزانین

سەرچـــاوەكانی لـــەبواری كۆمەڵایـــەتی لـــەو ســـەردەمانەدا بەدەنگدانـەوەی گـەورە لێـی دەدوێـن و باسـی دەكـەن، چ جـای بـوارە سیاسـییەكان، لەبـەر ئەوەیـە تـا ئـەمڕۆش تەسـەووف بابەتێكـە بـەردەوام لێـی دەكۆڵرێتـەوە و بـیروڕای جـودای لێ دەكەوێتـەوە، تەسـەووف ئێسـتاش ڕەگـی بـە هەنـدێ لـە نێوەندەكان كشاوە، ئەگەر بە ووردی لێ بڕوانین.

سـەرهەڵدان و سەرچـاوەی وشـەی (سـۆفی)یش بـە هـەر شـێوازێكەوە بـێ، لـەم بازنەیـە، لـەم هاوكێشـەیە دەربـاز نـابێ، نەخاسـلە تەسـەووف هـەر بەشـێكی سـەیری دەكـەی، بەرە بـەرە دەكشـێ و فـرەوان دەبـێ، دوای ئـەوەی تەسـەووف لـە چـەند سـەدەیەكدا بـە قـووڵی ڕەگـی كۆمەڵایـەتی و هـەتا بڕێـك سیاسـی پەیدا كرد، لە دەوڵەتی ئیسلامی دا بە فرەوانی كشا، هەم لە بابەت خـودی تەسـەووف وەكـو (ئـەزمونێكی زاتـی) و هـەم لـە بابـەت نووسینەوەی ئەو (ئەزموونـە زاتییـە)، كتێب و سەرچاوە كەوتنـە نـاوەوە، دەبـێ ئـەو سـەرنجەش بخەینـە ڕوو، كـە تەسـەووف بـووە سیمایەكی كۆمەڵگای ئیسلامی و سـەراپا ناوچە و ویلایەتـەكان و میرنشینەكانی گرتەوە، تا ئەو سەردەمەی درەوشاوە بوو، زۆربـەی سەرچاوە و كتێبەكان، لەوەوە دواون، كە چلۆن وشـەی تەسـەووف هـەر لەسـەرهەڵدانی شۆڕشـی ئیسـلامەوە، لـە پـەیامی ئیسـلامەوە ڕێچـكەی گرتـووە، ئـەوەی لێـرەدا مەبەسـتمانە خـودی چـەند وشـەیەكە، بـەڵام یـەك واتـا خـۆی لـە ژێریـەوە حەشـارداوە، لەبـەر ئەوەی دەكرێ بڵێین كۆمەڵێ وشە لە ئارادا هەبووە بۆ گوزارشت لـە تاقە مەغزایەك، واتایەك، كە تیایدا ڕۆژ بە ڕۆژ بنـەماكانی گەشـەی

سەندووە، لێرە دەردەکەوێ لەو ساتەی وەك زانستێك بالاّ دەست بووە، حەتمەن بەرە بەرە بۆ سەرچاوەی گەڕاوە، کە لە ساتی زانستی و پێش ئەوکاتە، بە واتا هەر لە (زوهد)ەوە، وەك هێڵێکی دانەبڕاو یەکەکانیان پڕ کردۆتەوە و لاشیان گرنگ بووە، لەو خاڵەوە دەست پێ بکەن کە سەرچاوەیەکە، نەك تەنها بۆ تەسەووف، بەڵکو بۆ سەراپا کۆمەڵگای ئیسلام، کە قورئان و حەدیس و سوننەت پێگەی بنەڕەتی پێکدێنن و زانستەکانیش لەوەوە پەرت دەبن، وەك دیارە مێژووش ئەمەی چەسپاندووە.

تەسەووفی ئیسلامی بۆ خۆی وەك فرەوانتر لە دیاردەیەك تایبەتە بەو خاسڵەت و سیمایانەی کە لەسەرەتاوە لە قورئان و حەدیسەوە هەڵێنجراوە و سەرچاوەی گرتووە، چونکە نابێ ئەوە لە یاد بکەین چلۆن کارو کردەوەکانی خەڵکان بەپێی ڕێنماییەکان و بەرنامەکان بەڕێوە چوون؟! چۆن لەو خاڵەدا کارکراوە کە زامنی چەمکە هەمیشەییەکان بووە؟! تا ئەو پرسیارەی کە دەمانگەیەنێتە ئامانج، ئەو ئامانجەی گەلێ ئامانجی تر و مەسەلەی گرنگی لە خۆ گرتووە!!! ئەو تەسەووفەی وەك کارکردنێك کە نەك سەدەها بگرە هەزارەها کەس زیاتر کاریان بۆ کردووە، لەوەش دیارە ئەم لایەنە ڕوحییە بەرفرەوانە لە زەمەنێکدا زۆر پێویستی دروستیان کردووە و هەمدیس بۆ خۆی سەرچاوەی بوونی مەوجوود (ئامادە) بووە، هەر لە دەروازەی بابەتی تەسەووفی ئیسلامی سەرەتاکەی لە وشەی (سۆفی) دەکۆڵرێتەوە، گەلێ پرسیار و دوان هەن، کە لێرەدا تا پێمان بکرێ هێندەی لێ دەخەینە ڕوو.

مەسەلەی پەرستن و گرنگی نەدان بە ماڵ و سەروەتی دونیا لە کۆمەڵگای بەر لە ئیسلام دیارە، دەتوانین ئەوەندە بڵێین لەبەر ئەوەی عەرەب خێڵەکی بوون، ڕژێمی بەڕێوە بردنیان لە خۆوە بووە بەپێی ژینگەیان، لەو چوارچێوە بە شێوەیەکی پەرت و بڵاو شێواو بەڕێوە دەچوو، ئیسلام کە بە توندی خۆی چەسپاند و لەگەڵ نەتەوەکانی تر لە ڕووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری ڕوو بەڕووی یەکتر بوونەوە، هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی لە بابەت پەرستن و تەقواوە ئەوەی هێنایەکایەوە کە پشت بە کتێبی پیرۆزی ئاسمانی قورئان ببەستریّ، کە بە شێوەیەکی شارستانیانە مامەڵە دەکا، چونکە ئەو بەرنامە ڕوحیەی قورئان هێنایەکایەوە بە ڕوونی دیارە دەیەویّ ژیان لە پاکترین شێوەدا کۆنترۆڵ بکا، وەك چرایەکیش، وەك مەشخەڵێك توانی سەدەی تاریکی کۆتایی پیّ بهێنیّ و ڕووناکی بخاتە ناوەوە (و لە سەدەی تاریکیەوە بوو بە سەدەی زێڕین).

وشەی تەسەووف بوونی لە ئاستێکدایە کە دەبیّ بەپێی زەمەنەکان لێکی جودا بکەینەوە، چونکە ئیسلام لە ڕۆژی سەرهەڵدانیەوە کە قورئان بووە پەیڕەو و بەرنامەی سەراپا ژیان، ناتوانین خاڵی بکەینەوە لە تەسەووفێك کە بەشێوەیەکی سەرەتای خۆی لە زیکرو تەقوادا دەبینێتەوە، لە هەمان کاتدا پێویستی ڕۆژگاریش هەندیّ سیمای خۆی چەسپاند، تاکو لەسەرەتادا تەسەووف بوونی مەغزاکەی دەسەڵاتێکی فرەوانی نەبیّ، وەك دەریش کەوتووە، ئەگەر لە مەغزا و واتای وشەی تەسەووف و پەرەسەندن و گۆڕانکارییەکان لەوبارەوە بڕوانین و لێی ووردتر

بینەوە بۆ سەرەتا و بنەچەی لە نووسینە بەراییەکانی یاخود زانراوەکانی زوهد و تەسەووف بڕوانین، لەگەڵ خودی نووسینەکان و بەشێوەیەك تاکو ئێستاش بیروڕای جودا جودا هەن جا هێڵی وشەکە لەلایەك و لەلایەکی تر هێڵی مەغزاکەی لەوەوە کە ئایا دەبێ پەرەسەندنی ئەم هێڵانە بەیەکەوە بووبێت!!؟! یاخود لە کوێ وە سەرچاوەی گرتووە!!؟ لەبەر ئەمەش بیروڕاکان لەم ڕووەوە جیاکارییان پێوە دیارە، چونکە ڕەنگە ئەم هێڵانە سەرەکی بن، لە هەمان کاتیش هێڵی تر هەبن پەیوەندییان پێوە هەیە و کاریگەرییان بە قووڵی بەسەرەوە دیارە.

وشەی تەسەووف گەلێ گرفت و لایەنی هەیە، بەتایبەتی ئەوانەی لە بابەت تەسەووفی ئیسلامیەوە گوزارشت لێکراون، لە حاڵێکدا کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر نووسراوە، ئەمەش بۆ ئەوەمان دەگەڕێنێتەوە، کە بابەتی تەسەووف چەند بە قووڵی لە زەمەنێکدا لە کۆمەڵگای ئیسلامدا دەسەلاّتی فرەوانی هەبووە، کە مەبەستمان ڕووە کۆمەلاّیەتیەکەیەتی، لەگەڵ ئەمەش ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مێژووی ئیسلام سەرەتا و سەدە زێڕینەکان و تا ڕووخانی تەسەووف سەراپا لایەنی ڕوحی کۆمەڵگای ئیسلامی تەنیوە.

وە نەبێ هەرتەنها وشەی تەسەووف بۆ سەرچاوەی دیکە برا بێ، بەڵکو لێدوان و بیروڕای زۆر لە بابەت بوارەکان و ناوەڕۆکی تەسەووفیشەوە هەن، تا ئەو ڕادەیەی بە جۆرێ تەسەووف بۆ ناواخنی تر بردراوە، هیچی بۆ خۆی نەماوەتەوە، ئەوەی هەیەتی زۆربەی لە دەرەوە وەری گرتبێ لە ساتێکا دیارە تەسەووفی ئیسلامی لە پڕو لە ناکاو دروست نەبووە، ئەگەر ناوە ناوە بیرو

بۆچـوونی وەك تەسـەووف لـە دەرەوەی کۆمـەڵگای ئیسـلامی هەبووبیٚ، یا ئەوەتا ئەگەر شتێك لە تەسەووف لەگەڵ شتێکی تر پێك بچیٚ، بیٚ هیچ لۆژیك و پەیوەندی بەتین بۆ یەکی دەگەڕێتەوە، چونکە ڕێچکە و بیرو بۆچوونەکانی کۆمەڵگا و شارستانیەتەکانی دیکە بمانەویٚ یا نەمانەویٚ لەسەر مەسەلە ڕوحییەکان دواون، کە ئەمەش بۆ خۆی لایەنێکی تەسەووف پێك دێنیٚ، بەڵام مانای ئەمە نیـە تەسـەووف یەکسـەر گوزارشـتێکە بـۆ خـۆی، وەك دیـارە تەسـەووف خـاوەن سـەرهەڵدان و ڕەوش و پەرەسـەندن و چوارچێوەی خۆیەتی و بەکۆمەڵگای ئیسلامەوە پابەندە، بوونی بە کۆمـەڵیٚ خاسڵەت و سیماوە بەستراوەتەوە، کە دروست بوونیـان یەکە یەکە لە ناواخن و هەناوی خۆی دا دروست بووە و مێژووش قۆناغ بە قۆناغی دەست نیشان کردووە، کاتێکی زۆری ویستووە، تاکو بگاتە ئەو ئاستەی بە زانست بناسریٚ.

فـرە بیروڕاکـانین لـە زۆر بابـەتی تەسـەووف دا هـەن و هاتوونەتەکایـەوە، وەك دیاریشـە هەنـدێکیان لـە بابەتێکـەوە گوزارشت دەکەن، لە سەرێکی دیکە بۆ ناوەڕۆك یاخود زمان یا ناونـان دەگەڕێنـەوە، ئەمـەش ئـەوە دەسـەلمێنیٚ بـۆ خـۆی چـەند ڕوانگە و ڕامانێکی هەیە و هەر یەکێکیشیان هەر هەمووشیان لە خاڵێکەوە دەست پیٚ دەکەن، بۆ خۆی چەقێکی دیاری کراو نیە، بەقەد ئەوەی لە مەسەلە ڕوحیەکان بەرجەستە دەبیٚ، کە ئەمیش بۆ خۆی بە توندی بە قورئان و حەدیس و سوننەوە بەستراوە، بە هێڵێکی سەرتاپا گیرەوە پەیوەستە.

لەگـەڵ هـەموو ئەمانـەش دەبـێ سـەرنجی ئـەوە بـدەین چـۆن لەسەرەتا وشەی (سۆفی) هاتۆتە ناوەوە؟!! چۆن ئەو ناوەڕۆکەی هەیەتی تەواو نەیتوانیوە بابەتێکی زانستی و فرەوان پێك بێنـێ؟! بـەڵام دوای بـە هـەوڵ و کۆششـی چـەندان کەڵـەپیاوان و ڕێبـەرانی ئەم ڕێگەیە چوارچێوەیەکی تەواویان بۆ دروست کردن، کـە هێنـدە مەغزا و بابەتی فرە لەخۆ بگرێ وەك زانستێك سەیر بکرێ.

وەك ئیمـامی(السـهروردي) لـە کتێبـە بەناوبانگەکەیـدا (عـوارف المعارف) دا لە بابەت تەسەووفەوە هێندەی پێ کراوە ویسـتویەتی ئەو زیکرو ڕێگە بەرفرەوان و گەورەیـە لـە چوارچێوەی نووسـین دا بەرجەستە بکا، ئەوەتا لـە ژێـر سـەردێری (لـە باسـی ناونانیـان بـەو ناوە) پاش ئەوەی وەك سەرچاوە کۆنەکانی ئەو سەردەمە کۆمـەڵێ نـاوی هێنـاوە کـە کـێ لـە کێـی بیسـتوە و گێڕاویەتـەوە، دەڵـێ: (ئـنـس بـن مالـك(ﷺ) گـوتی: پێغەمبـەری مـەزن (ﷺ) کـاتێ بـۆ پەیامەکـەی خـەڵکی دەدوانـد، سـواری گوێدرێـژ دەبـوو، پۆشـاکی خوری (بەواتا سوف)ی لەبەر دەکرد، لەم ڕووەوە خـەڵکی بۆ ئەوە چوون، کە ناونراوە (سۆفی) تاکو جلوبەرگی خۆی دەرنەخا، لەبەر ئـەوە جـل و پۆشـاکی خـوری (سـوف)ی هەڵبـژاردووە کـە جلێکـی چاکە و پۆشاکی پێغەمبەرەکان(علیهم الصلاة والسلام) بووە)[1].

---

[1] - جێگەی سەرنج کاتێ کتێبی (إحیاء علوم الدین)ی ئیمامی غەزالی چاپکراوە لە چەند کتێبێکدا لـە بەرگی دواییدا چەند کتێبێ چاپکراوە کە پەیوەندیان بە (إحیـاء علـوم الـدین)ەوە، هەیـە چ لـە ڕووی شـێوە چ لـە ڕووی نـاوەڕۆك . جـا لـە بەرگی پێنجەم (عوارف المعارف)ی ئیمام (السهروردي) چاپکراوەتەوە، ص٦٧.

سەرنجی گرنگ لێرە ئەوەتا چەند وشەی (سۆفی) بەناوە ڕۆکێکەوە پەیوەستەکە سنووری دیاریکراوی هەیە، لەلایەکی تریشەوە ئەوەی گرنگترە خودی (سۆفی و تەسەووف)، ئەگەر بە مەغزا سەرەتاکەشی بێ لەو زەمەنەدا لە کردەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بوونی هەبوەوە و دەبێ، کەواتە لەلایەنی پێغەمبەر(ﷺ) سەرچاوەی گرتووە و ئاوڕی لێ دراوەتەوە، کە خەڵوەت کێشان نموونەی بەرزن، هەروا کە پەیامی خوداش ڕاگەیەنراوە بۆ دواجار، بۆ خۆی خاڵێکی وەرچەرخان بووە، بە گشتی بەسەر هەموو لایەنەکان و ڕاکشا بەسەر هەموو کەسێ هەموو بوونەوەرێ، هەموو شتێ جێ بەجێ کرا، بەڵام لەمەی سەرەوە دەردەکەوێ، کە لەبەرکردنی پۆشاکی خوری (سوف) پێناسەکەیە بۆ جل و بەرگی ئەو کەسانەی کە گرنگی بەماڵ و موڵك و سەروەتی دونیا نادەن و پشتیان تێ کردووە و لە مەغزای هەژاری دا خۆیان بوونەتە ئەسڵی مەسەلە، نەك کردەوەیان، کە بۆیان دەگەڕێتەوە، بێگومان پەیامی پیرۆزی ئیسلام بەم شێوەیە ڕێچکەی گرتووە، کە پەیامەکە دوورە لە عەقڵی مرۆڤ، بەسەرەوەی هەموو شتێکی مرۆڤایەتی یە، دیارە بە سادەیی ئەم ناوەڕۆکە قووڵەی پەخش کردووە، وتیایدا چوارچێوەی زێڕینی داناوە بۆ گشت مرۆڤەکان بۆ گشت گەردوون، مەبەستیش لە جلێکی چاکیش هەموو ئەو واتایانە لە ڕەوشت و ڕەفتارو کرداردا خۆیان دەنوێنن.

لەمەوە خودی ئەو پرسیارە دەکەوێتە ناوەوە کە سەرچاوەی وشەی (سۆفی) لە چییەوە هاتووە؟! وشەی (سۆفی) چی یە؟! ئەمە زیاتر بۆ ناسنامەی دەگەڕێتەوە، پاشان مەستمان لە بابەتی لە چییەوە هاتووە؟!! یانی خواستنی لەو بەرگەدا، ئینجا خۆی بالاّ دەست کردووە؟! سەرەتای ژیانی ڕوحی لای موسڵمانان بۆ پێغەمبەری مەزن و گەورە(پیرۆزە) (محمد ﷺ) دەگەڕێتەوە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خۆی لەوەوە چەمکی (زوهد و زاهید) چەکەرەی کردووە و تیایدا تواوەتەوە، ژیانی ڕوحی پەیڕەوکردووە و هەمووماني بەو پەیڕەوە فێرکردووە، بەلاّم هیچ کاتێ بانگەشەی ئەوەی نەکردووە، کە پشت لە دونیا بکرێ، ئەوەتا ناکۆکی ژیانی گۆشەگیری (ڕاهیبە نەصارییەکان – الأحناف) مەسیحیەکان باس دەکا، بەلاّم ئەوەشی هێشتۆتەوە کە دەبێ مومارەسەی ڕوحی لە ئارادا هەبێ، کە لایەنی (زوهد) ماوەتەوە، وەك نوێژ و ڕۆژوو گرتنێك، کە سۆفییەکان لەوە دەستیان پێکردووە و ناوەڕۆکی مەزنییان دۆزیوەتەوە، ڕێگەیەکیان دۆزیوەتەوە، هیچ دژایەتی شەرع ناکا، جا بارودۆخی ژیانی ڕوحی ئیسلامیش بەم شێوەیە پەرەی سەند، کەواتای سۆفی بگوازێتەوە لە زانستێکدا بەناوی تەسەووف، دەبێ ئاگاداری ڕەگەزی کات و شوێنیش بین تیایدا ڕۆڵی مەزنیان هەیە، چونکە زۆرجار هێرشی ناڕەوای بۆ کراوە، ئەوەی دیاریشە سەلمێنراوە ناتوانرێ تەسەووف لە ئاینی ئیسلام جودا بکرێتەوە.

ئیمامی (السهروردي) لە هەمان بەشدا لەو بارەوە درێژەی پێ دەدا و دەڵێ: (حەزرەتی عیسا(عليه السلام) جل و بەرگی خوری(سوف)و لە موو چنراوی لەبەر دەکرد، و لەبەری دارو درەختیش دەیخوارد، و لە

کـویّ ئێـوارەی بکردایـەوە ئـەویّ مـاڵی بـوو)[1]، ئـەوەی دەمێنێتـەوە چەند سیمایەك خۆی دەردەخا لەوەدا، کە بۆ ژیان دەمێکە ئەو ڕامانە مێشکی مەزنانی گرتووە، دوورکەوتنەوە لە ماڵ و سامان و خۆشی ڕووکەشانەی دونیا، ڕێگایەکی نوێیە، هەر تەنها پێغەمبەران دەیزانن و لە قووڵایی دا مەلەیان کردووە و ڕوانیویانە و لەززەتی حەقیقەت چەشتوویانە و پاشان بە ئێمەیان داوە، بەم جۆرە دوور لە حەزی ئێمە جلوبەرگی سادە بۆ خۆی خوری بووە، کەواتە ئەم جلوبەرگە لە نێو هەناویدا چەمکی خۆی هەڵگرتووە، ئامـاژەی خـۆی دەدا بـە دەستەوە، لە بەرانبەر ئەمەش گەلێ جۆری دیکە جلوبەرگ هەن، بەڵام جێگەی ناشایستەیە ئەوانەی گرنگی بە دونیا دەدەن، ئەوانەی بە تەنگ باق و بریقی دونیاوەن، ئەم پۆشاکە و جلوبەرگەیان مەبەست بێ، بۆیە جلوبەرگی ڕازاوە و بەنرخ و گرانبەها ئاماژەی لەو بیرو بۆچوونە کردووە کە گرنگی تەنها بەم ژیانە دەدەن و ئەم دونیا لایان گرنگە و ئەو دونیاش لە بیر دەکەن، لەگەڵ ئەمەشدا بوونی جلوبەرگی سادە کە لە خوری دا خۆی دەدۆزێتەوە مانای سادەیی ژیانیش بەدەستەوە دەدات، بێگومان ئەوەی ئەم ژیانە بەدوا وێستگە نازانێ، بەوبیروبۆچوونە بێتە پێشەوە، کە ژیانی تر بوونی هەیە، جا دوور لەو مەسەلە تەنها گرنگی بە ژیان و ئەم دونیا دەدەن، ئەوانەی چەندان ڕوویان هەیە و گەمەی تیایدا دەکەن، کە لە ئەسڵدا لەویژداندا ئەو حاڵەتە پەشۆکاوە دروست دەکا، هەم بڕوا ڕوو لەوە دەکا، کە مرۆڤ بە دڕندەیی بێتە ناوەوە و هەم بنەڕەتی خۆی ون دەکا و خۆی ناناسێتەوە و گومڕا دەبێت، چونکە ئەمان هەر تا هێندە بڕ

---

[1] – السهروردي، عوارف المعارف، ص٦٨.

دەكەن كە ئارەزووەكان بەڕێوەیان دەبەن، هەر ئەوە دەناسن و دەزانن، كە شتێك بەسەریانەوە نیە، لەبەر ئەوە شەرعیەت بە هەموو ڕەفتار و كردەوەیەكیان دەدەن، كە بەهۆی زەمەنێكەوە دەسەلاتیان هەیە و پەیدا كردووە، ئەوەش لە بنەڕەتدا كاتی یە و لەناو دەچێت، ئەو واتایانە بەو كەسە دراون، كە جلوبەرگ و سیپالی خوری پۆشیوە و پشتی لە دونیا كردووە و بەردەوام سەرگەرمی ژیانێكی تر بووە، كە ئەویش خواپەرستی یە... و ئەم ژیانەش لە ناوەوەیدا هێندە گەورەی كرد و، وە بەدڵنیایی بڕوانێتە هەردوو ژیان، لەبەر ئەوەیە ئەو كەسانەی بەم جۆرە ژیاون لە پێناو بەرنامە و ئامانجی خوای گەورە پێیان وتراوە– سۆفی– لەمە بێزاربیٚ، بۆ هیچ شتێكی دیكە هەنگاوی نەهاوێشتووە، لەمەوە هەست دەكەین كۆمەڵیٚ مەغزا بۆ بوونی جۆرە ژیانێك لە ئارادا هەبووە، بەلام ئەوەی كە كردۆتیە خانەیەكی مەزن و لە زانستدا بەرجەستە كراوە، لەو ساتەوە كە قورئانی پیرۆز هاتۆتە خوارەوە، تا گەورە پیاوانی تەسەووف بە هەولٚ و كۆششیان لەوێوە دەست پیٚ دەكا.

(السهروردي) دیسان لە هەمان بەشدا لەسەر زاری پێغەمبەری مەزندا(ﷺ) دەڵیٚ: (ئەو ڕۆژەی حەزرەتی موسا(عليه السلام) قسەی لەگەلٚ خوای بەخشندە و گەورە كرد، جبەیەكی خوری و جلوبەرگی خوری و پۆشاكی و سیپالی خوری لەبەر بوو، كلاوی خورینی لەسەر بوو، نەعلەكانیشی لە پێستی گویٚ درێژدا دروست كرابوون)[1].

---

١ – هەمان سەرچاوە، ص٦٨.

پێغەمبەرەکانیش(علیهم الصلاة والسلام) ئەوانەی خاوەنی کتێبی ئاسمانین و پەیامی خوای گەورەیان لەسەر زەوی بڵاوکردۆتەوە، بە بەرگی خوریني یەوە گەڕاون تاکو تروسکەی ڕووناکی بخەنە سەر زەوی و هەموو ڕووناکییەکان لەمە بخۆنەوە، لەمەوە ئەوە سەرهەڵدەدا، کە بوونی ئەم پۆشاکە بە پشت کردن لە دونیاوە پەیوەستە، ژیانی ڕوحی دەردەخا، بە دڵنیایی یەوە بۆ مرۆڤ پێویستە، ئەمەش لەلایەن خودای گەورەوە پشتگیری لێ دەکرێ، تاکو چاکە خوازی ببێتە سیرەی مەبەست و بەدەست بهێنرێ، دەبێ ئەوەش بزانین حەزرەتی موسا(ﷺ) ئاماژە بەوە دەدا، چۆن بەوپەڕی سادەیی و ناواخن قووڵەوە قسەی لەگەڵ خودا دا کردووە، بەشێوەیەك تەنها جلوبەرگ و سیپاڵی خوری کە دەلالەت لە بیرو بۆچوونی پشت ئەستوور بە خودای گەورە، دیاریشە خودای گەورە ئەو کەسانەی دەوێن پشت لە ماڵ و سامان دەکەن و خۆیان بە یەك ڕوو پیشان دەدەن، ئەویش لە پێناو خودای مەزن و میهرەبانە.

ئەگەر بمانەوێ ئەو ناواخنانەی لەو سەردەمەدا واتا پێش ئیسلام هەبوون لە بابەت تەسەووفەوە وەك لایەنێکی ڕوحی، لەگەڵ بوزییەکان بەقووڵی ئەم لایەنەیان پەیڕەو کردووە بخەینە تای تەرازوو، ئەوەی کردوویانە لەلایەکەوە لە باوەڕێکە سەرچاوەی گرتووە، بە هیچ جۆرێ پشت بە یەکتاپەرستی نابەستێ و بیروڕاکانیش لەوەوە ڕێی کردووە سەرەتا لە دونیا ڕابێنێ و پاشان دژی شەهوەتەکان بجەنگێ و بچێتە دونیای ڕوح و پشت لە جەستە بکا، کە ڕوونە دوو جیهان هەن جیهانی ڕوح و جیهانی جەستە، نەك خەڵقکراو و خەڵقندە، بێجگە لەمە ئەو

ناوەڕۆکانەی بەر لە ئیسلام لە ئایینە ئاسمانیەکان هەبووە، بەهیچ جۆریێ ناتوانریێ لەگەلێ پلەی تەسەووف بەراورد بکریێ، هەر چەندە گەلێ لە ڕۆژهەلأتناسان هەولیان داوە تەسەووف بۆ (ڕەهبانیەت) و گۆشەگیری نێو کلێساکان بگەڕێننەوە، بەلأم دوای ڕوانین دەردەکەویێ تەسەووف خاوەن پەیڕەو بەرنامەیەکی گەلێ پتەوە، هەر ئاینی ئیسلامە توانیویەتی بنەچەی زیندوویی بۆ دابڕێریێ وەك دونیا ببینینی ڕەوا بۆ جیهان بە پشت بەستن بە گوفتارو فەرموودەکانی خوداگەورە، تەنها ئەم هەولأنەیان لەوەدا گوزارشتی لێکراوە کە لە خودی وشەی تەسەووفەوە دەست پیێ بکەن و ئەو کون و لەبەرانەی مێژووی تەسەووف بگەڕێن کە سوودی لیێ وەردەگرن و لەبەرژەوەندی تێزەکانیان دایە.

لەگەلێ ئەوەی باس لەسەرچاوەی وشەی (سۆفی) دەکەین، بەلأم ئەم بابەتەش بۆخۆی بەناوەڕۆکی (تەسەووف لکاوە)، لەبەر ئەوە مەغزایەك بەر لە وشەکە لە کۆمەلگای ئیسلام دا بوونی بە قوولی هەبووە.

گەلێ بیروڕا هەن لە بارەی بەرواری هاتنەکایەوە وشەی تەسەووف، ئایا وشەی(تەسەووف) یاخود (سۆفی) لەهەر شێوازێکدا کە گوزارشت لە واتای (تەسەووف) دەکا بە چ شێوەییێ کاتە کایەوە؟!! وە ئەم شێوەیە لە چی یەوە سەرچاوەی گرتووە؟!.

وەك دەرکەوتووە ئەو کەسانەی پشتیان لە دونیا کردووە پێیان گوتراوە (زاهید) پاشان بۆ ئەم چەمکە گەلێ چەمکی فرەوانتر هاتۆتە ئاراوە، بەشێوەییێ ڕێگایەکی بۆ دانراوە و گەلێ زاراوەی تری لە خۆ گرتووە، تیایدا بەگەڕانەوە بۆ کەسەکان واتا بە

کەسەکان گوتراوە (سۆفی)، جا بەر لەمەڕ (لە زەمانی پەیامبەری گەورەدا بەهۆی نزیکی، وە هاوەڵی کردنی پەیامبەری گەورەوە، کە سەرچاوە و کانگەی نوری خوداوەندی یە، تەنها بەوەی کە ئەبونە یار و هاوکاری ئەوان بەو نزیکی یە هەموو دەرونێکی ژەنگاوی پاك ئەبویەوە، وە (شەرەفی سوحبەت) واتە سەربەرزی هاوڕێیەتی، ئەیبردنە پلەو پایەیێکی (مەعنەوی) وەها، کە ئەمڕۆ بە هیچ تێکۆشان و دەس مایەییێك، دەستی ئێمە ناکەوێ، وە حاڵەتی (عین الیقین) دەستی ئەدا بۆیان، ئەگەر ئەو باوەڕە نەبوایێ (بیلالی حەبەشی ﷺ) چۆن بەرانبەر بەو هەمووە ستەمە خۆی ئەگرت و ئەیوت: (أَحَدٌ أَحَدٌ)، وە چۆن ئەم خەڵکە ئامادە ئەبو گیانی بخاتە سەر لەپی دەستی وە بڕوات بەرەو پێشی مەرگ، ئەو ڕۆژە بە ڕێڕەوانی ڕێگەی حەقیقەتی ئیسلامی وتراوە (ئەصحاب)، پاش ئەوانیش بە شوێنکەوتووانی ئەوانیان گوتووە (تابعین)، وە ئەکرێ بڵێین: هەمووی ئەوانە یان زۆربەییێکی نزیك لەوەی کە بکرێ بڵێین هەموویان، هەمووی هەر بەوجۆرە خاوێن و پاك بوون، وە موییێك لە کردار و گوفتاری پەیامبەر(ﷺ) لایان نە ئەدا، جا لەسەردەمانی (تابعین)دا وردە وردە موسڵمانەکان کەوتنە سەر ڕێگەی ماڵ و سامان بەیەکەوەنان و بەدەس هێنانی پلەوپایەی دنیایی و خۆش گوزەرانی، جا لێرەدایە و لەم بواری ئەزموون و تاقیکردنەوە دایە، ئیتر بڕێ لەوانەی کە ئەیانەوێ بەخاوێنی بمێننەوە، وە خۆیان لەم بازارە گەرم و هەڵخەڵەتێنەرە ڕزگار کەن، دەس ئەکەنە سەرزەنشتی لاڕێ ڕەوان)[1].

---

١ – ئەمین شێخ علاء الدین نەقشبەندی، تەصەووف چی یە ؟ ل١٠٥ و١٠٦.

ئەمە لەکاتی پێغەمبەر(ﷺ) و هەروەها (ئەصحابەکان)دا، هەروا (تابعين) کە تیایدا پەرستش و کۆمەڵگا لەیەکەوە نزیك بوون، ئەم وشانە هاتوونەتە ناوەوە، هەتا (لە دژی خەلیفەکانی ئەمەوی، وەکو (ابو ذر الغفاري رضي الله عنه)، وە خۆیان گرتە کەنارەوە، کاتێ زانی یان ئەم هەموو خوارو خێچی یە بەوان ڕاست نابێتەوە، وە ئەم هەموە کە لەبەرە بەوان پڕ ناکرێتەوە، ئەم هەموو کۆسپە بەوان تەخت ناکرێ، ناچار کەوتنە ئەوەی کە تێکۆشن، هیچ نەبێ (ئیمانی) خۆیان سەلامەت دەرکەن، وە ئەگەر بۆیان کرا لە ڕێگەی ئامۆژگاری یەوە خەڵك لەم داوە ڕزگار کەن، جا ئا لەو سەردەمەوە کە موسڵمانی ڕاستەقینە خۆیان ئەگرتە کەنارەوە لە فریو خواردنی سامان و پلەوپایە وە ناوی (ئەصحاب) کەم کەم ئەبڕایەوەو دوایی ئەهات، ناوی تازە بڕا بەسەری ئەم دەستەی خواپەرستە ڕاستەقینەدا، وە یەکێ لەم ناوانە کە نرا (صوفی) بوو، هەروەها وشەی (زاهید) هەرچەن بەر لە ئیسلامیش وشەی زاهید لەناو عەرەبا بیستراوەو، هەروەکو زوتریش وتمان زاهید بە کەسێ ئەوترێ کە پشت هەڵ کات لە ماڵ و سامان و پلەوپایەی دنیایی، لەناو عەرەبا بوە، بەڵام وشەی صۆفی، لەسەردەمی (تابعين)ەوە، واتە چینی پاش (ئەصحاب) ئەکەوێتە بەرچاومان)[1].

١ – تەصەووف چی یە ؟ ل١٠٦.

وەك ڕوون بۆوە وشەی تەسەووف گەلێ بە مەغزا و سەردەمەکەی لکاوە، ڕۆژ بە ڕۆژ لێکۆڵەرانی تەسەووفی ئیسلامی زیاتر بیروڕاو بۆچوون دێتە ناوەوە کە ئەم وشەیە چۆن سەری هەڵداوە؟!! لە ڕووی وشەی (تەسەووف) و(سۆفی) لە عەرەبیدا (التصوف) (الصوفي) ئامارژە بۆ بابەت و کەسەکان، بە واتا (الصوفي) یا (صوفی) دەری دەخا لە (سوف)ەوە هاتووە، بەجۆرێك قوماش یا پارچە دەگوترێ، وشەی (تصوف) چاوگی فرمانی (تَصَوَّفَ)یە، ئامارژەیە بۆ- الصوف- بەدەرخستنی ئەو پەیوەندییە قووڵە و ئاشکرایەی لە نێوان تەسەووف و زوهد بە مانا فرەوانەکەی هەیە، هەتا ئەو بیرو بۆچوونانەی هەن زیاتر لەبارەی وشەی- التصوف- دا دەڵێن لە ڕاستیدا بە زوهد و پشت لە ماڵی دونیا کردنەوە پابەندە.

وەك دەست نیشان کرا لەبارەی وشەکەوە باری کەسەکان و چالاکییان گرنگی یەکەمی نیشان دا لەبەر ئەوە دوو مەسەلە دێتە ئاراوە و خۆیان بەپێشی دەخەن یەکەمیان ئەوەی پابەندە بەکەسەکان و دووەمیان ئەوەی بە وشەکەوە پابەندە، دەبێ بەم دوو تێزە لە وشەی تەسەووف بڕوانین:

<u>یەکەمیان:</u> (ئەوەی پابەندە بە کەسەکان) لێرەدا مەسەلەیەکی دیکەمان بۆ دەردەکەوێ کە ڕەنگە کار لە بەرواری وشەی (تەسەووف) و (سۆفی) بکا، بەهەر حاڵ کە بەم سەردێرە ڕێکمان خست، بۆ خۆی پابەند بوون بە کەسەکان دەکەینە هەندێك لە مێژوو، هەروەها بەرواری وشەی (صوفی)، لێرەدا ئامارژە بە چەند ڕووداوی دەکەین بەسەر ئەم ئەولیا و ڕێبەر و پیاوان دا هاتووە و پەیوەندی بە بابەتەکەمانە وە هەیە، سەرەتا لە خواناسی گەورە (حسن بصري)

( ٢١ - ١١٠ك / ٦٤٢ - ٧٢٨ز ) دەست پێ دەکەین (کە یەکێکە لە گەورە پیاوانی ڕێڕەوی تەصەووف لە باسی سەرگوزەشتی خۆیا ئەڵێت: (رَأيتُ صُوفِيًا في الطَّواف، فأعْطيتُه، شيئاً فَلَمْ يأْخُذْهُ وقالَ معي (اربعة دوائيق فيكفيني ما معي) واتە لە کاتی تەوافی کەعبەدا چاوم کەوت بە (سوفی) یێك شتێکم دایێ لێی وەرنەگرتم، وە گوتی خۆم پێنج (دراوم) پێ یە وە ئەوەی کە پێمە بەشم ئەکات)[1].

ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە وەك سەرچاوەکان دەڵێن بەر لە سەدەی دووەمی کۆچی بێت، چونکە لەبارەی (حەسەنی بەسرِی)یەوە دەبێ بزانین کە (قطب) بووە لە پەرستشی بەسرە و بگرە تەواوی عێراق لەوسەردەمەدا بۆوەتە مامۆستای ئەم ڕێبازە، بگرە لە چەندان شوێن ڕوویان تێکردووە و لەوەوە زوهد و ناوەڕۆکی تەسەووف فێربوون، لەبەر ئەوە دەگوترێ کە قوتابخانەکانی دەوروبەری شاری بەسرە کاریگەری خودی (حەسەنی بەسرِی) بەسەرەوەیە، لەوانە (الکوفة) و(بغداد)، کە دواتر ڕۆڵی سەرەکییان لە زانستی تەسەووف دا گێڕا، هەتاوا باس دەکرێ کە قوتابخانەی زوهد بۆتەوە کانگاو بنەما و دەروازەی قوتابخانەی بەغداد، کە خودی قوتابخانەی زوهد لە بەسرە، بە کۆمەڵێ بیرو بۆچوون کاریگەر بووە و لەسەرووی هەموویان پەیامی ئیسلام کە شێخ (حەسەنی بەسری) بەر جەستەی کردووە.

---

١ – هەمان سەرچاوە، ل١٠٧.

(حەسەن بەسری) دەڵێ: (حەفتا کەس لەوانەی لە شەڕی بەدر بەشداریان کردبوو، چاوم پێ کەوتوون جلوبەرگیان خوری (الصوف) بوو)[1].

هەروا لەم ڕووەوە (ابوهریرة و فضالة بن عبید) (رضي الله عنهما) بەجۆرێ وەسفیان دەکا، کە ئەمانە خۆیان لە خواردن بواردووە و برسی بوون، هەتا عەرەبەکان پێیان گوتوون شێت، کە جل و بەرگ و لیباسیان- صوف- بووە، هەتا هەندێ لەمانە بۆنیان لێ هاتووە و ئارەقەیان کردووە و سەریان سوڕی خواردووە، هەروا لە بارەی دوو کەسێتی تر لەوانە (جابر بن حیان) و(ابو هاشم الصوفي) جێگەی گرنگی تەواوە، چونکە ئەمانە هەردووکیان خەڵکی (کوفە) بوون، ئەوە بەدەر دەخەن لە شاری (کوفە)دا کە بەرانبەر بەو بزاڤە زوهدەی هەبووە و شاری بەسرە پێی ناسراوەتەوە، هەروا شاری کوفە بە- تصوف- و شاری بەغدا بە قوتابخانەی ڕێبەران دیارە، لێکۆڵەران کۆکن لەسەر ئەوەی واژەی (سۆفی) بۆ یەکەمجار بۆ کیمیاوی (کیمیاگەری) بەناوبانگ (جابر بن حیان) بەکار هاتووە، کە لە (کوفە) دانیشتووە، ئەمەش دەرخستنێکە بۆ واژەکە کە یەکەم جارە بەکارهاتووە و گوزارشتی لە پەرستشی ئەوان کردووە، لەبەر ئەوە بۆ یەکەمجار لە عێراق بەکارهاتووە، دیارە ئەمە لەو بەرواره نزیك دەبینەوە، کە ئەوکاتە لە نیوەی دووەمی سەدەی دووەمی کۆچی دایە، ئەمە واژەی (صۆفی) بە تاك بەکارهاتووە بۆ کەسێ کە (جابر بن حیان)ە، کە

---

١ - عوارف المعارف، ص٦٨.

ڕێگەیەکی تایبەتی هەبووە لە پەرستش لە شاری (کوفە)دا هەروا هەندێك ڕایان وایە کە بەهۆی کۆ (جمع) (الصوفية) بەکار هاتبێ ئەم داڕشتنە پابەندە بەو فیتنەیەی لە میسر لە ئەسکەندەرییە هاتووە لە ساڵی (١٩٩)ی کۆچی، کە ئاماژەیە چ بە تاك (مفرد) و چ بە کۆ (جمع) دەبێ پەیوەندییان بە یەکەوە هەبێ.

ناتوانین ئەوانەی لە بابەت (جابر بن حیان) گوتراوە لە (ابوهاشم الکوفي)دا بڕێنین، چونکە لە یەك شار بوون لە ڕووی جوگرافی هەروا هەردووکیان دوو خواپەرستی گەورە بوون و لەیەك ڕێبازدا بوون، بۆیە ناویان بەیەکەوە دێ و هەردووکیان واژەی – صوفی – یان پێ وتراوە، (ناونراوە بەم ناوە (ابوهاشم)ی کوفی سۆفی بەناوبانگ دیسان نێو براوە کە یەکەم کەسە ناونانی (الصوفي)ی بۆ بگەڕێتەوە)[1].

ئەمەش لەخۆوە نەهاتووە، بەڵکو زوو چەمکی گرتووە بۆ ئەوە ئەمە چڕۆ بکا، لەبەر ئەوە (سفیان الثوري) (٩٧– ١٦١ ك) (٧١٥– ٧٧٨ ز) دا دەڵێ: (لولا ابوهاشم الصوفي ما عرفت دقيق الرياء)[2]. بەو پێیە گەر (ابوهاشم الصوفی) نەبووایە نەیدەزانی و بۆی ڕوون نەدەبۆوە (ریا) چۆنە و چی یە؟! بەو پێیە– صوفی– لەسەرەتای ئیسلامەوە هەبووە، کە لێرەدا مەبەستمان لە مەغزا و پەرستش نیە، یانی سەرباری ئەمانە، بۆ خۆی واژەکەش هاتۆتە

---

١ – عزيز السيد جاسم، متصوفة بغداد، ص ٥٢، شركة المعرفة للنشر والتوزيع – بغداد ١٩٩٠.

٢ – عوارف المعارف، ص٦٩.

ناوەوە، چونکە بۆ شایی نیە لە نێوان زوهد و تەسەووف" بەڵکو بەتوندی بەیەکەوە گرێ دراون و زوهد پەرەی سەندووە وەك پارێزگاری و خواپەرستی ڕاستەقینە، ئینجا هەموو کەلێنێکی مەعریفەی خۆی تەنیوە لە پێناو زانستێکی سەربەخۆ بۆ ئەوەی بچێتە نهێنیەکانی پەرستش.

لەم ڕوانگانەدا چەند بیروڕایەك هاتوونەتە ناوەوە تاکو ئێستا بەدەری دەخەن کە ئەو پیاوانەی چالاکییان هەبووە و بە تەنگ پەرستشەوە بوون لە بارەی واژەی تەسەووف دیارە کە خۆیان لەسەدەی یەکەمی هیجری ژیاون و واژەکە لەسەدەی دووەمی هیجری بەکارهاتووە، هەرچەندە ئەمە ئاسایی یە؟ چونکە لەسەدەی یەکەم دا (زوهد) هەموو کەلێنێکی تەنیوە و بەرەو فرەوانتر (تەسەووف) هاتۆتە ناوەوە، بەگوێرەی- ابوهاشم الصوفي -، سەهرەوەردی دەڵێ: (ئەمە دەلالەتە بۆئەوەی ئەم ناوە لە کۆنەوە زانراوە، بەرلەوەی بناسرێ کە ئەم ناوە بۆ سەدەی (٢) هیجری دەگەڕێتەوە)[١].

هەروەها لەبارەی پابەند بوون بە کەسەکانەوە، سەرچاوەکان ئەوە دەست نیشان دەکەن واژەی (صوفی) بۆ هەندێ لە سۆفییەکان بەکارهاتووە، بێگومان سۆفی ئیسلام کە ئەمانە لە بنەڕەتدا تایەفەیەك بوون لە ئەهلی کوفە، جا دوا سەرۆکیان (عبدك الصوفي النباتي)(٢١٠ ك) مردوو بووە، جێگەی باس کردنە لە شاری بەغداد وەفاتی کردووە، لە کاتێکا باس لەمە دەکرێ، ڕێبازێك لە ئارادا هەبووە و بە ڕێبازی تەسەووف ناوزەدکراوە، جا هەر چۆنێك بێت لە

---

١ – عوارف المعارف، ص٦٩.

بابەت واژەکەیە لە نێو سەرچاوەکان دەگەینە ئەو ڕاستییەی لە شاری کوفە هاتۆتە ئاراوە و بەم شارە وابەستەیە.

هەروەها بۆ پابەندە بەکەسەکان ڕووداوی تریش لە ئارادا هەن، کە هەندێ گوتە هەن بە تەواوی بە چەمکی تەسەووفە پابەندن، جا ئەگەر بەم واژەیە نەبێ لەوانە لە چینەکان (الطبقات) گەلێ نووسراوە و زۆر ناوی درەوشاوەی ئەم ڕێبازەی تێدایە، کە ڕوویان لە زوهد کردووە و وازیان لە دونیا هێناوە و هەر خەریکی پەرستش بوون، لەوانە (الربیع بن خیثم)(٦٧ ك) مردووە، کە بەگریانەوە گوزارشتی لەخۆی کردووە و بانگی داوە کە ئەوەی بە کوشتن کوشتویەتی نەفسی بووە، هەروەها (معضد إبن یزید العجلي)(نازانرێ کەی مردووە) کە لەگەڵ کەسێ دەرچوون و بەردەوام خەریکی خودا پەرستی بوون، هەروا (خباب بن الأرت ﷺ)[1].

هەرچۆنێك بێت مەڵبەندێ سەرهەڵدانمان بۆ دەرکەوت لە ڕووی واژەکەوە بەڵام وەك مەغزا لای ئێمە گرنگە کە سەراپا کۆمەڵگای ئیسلامی گرتۆتەوە، چونکە لە ساتێکا ئەمە باوەك واژەیەك لە کۆ (جمع)دا (صوفیة) بۆ عێراق و دەوروبەری بەکارهاتووە، لەبەرانبەردا واژەی (الملامتیة) بۆ خوراسان بەکارهاتووە.

بەکارهێنانی ئەمە بەجۆرێ گەشەی سەندووە کە (صوفة) یان بۆ بگەڕێتەوە، دیارە ئەمەش نازناوبووە بۆ پیاوێکی جاهیلی کە ناوی (الغوث بن مرّ) بووە، کە دایکی کردویەتیە سەدەقە بۆ کەعبە

---

١ – عدنان حسین العوادي، الشعر الصوفي، ص ٥٥، دار الشؤون الثقافیة العامة – بغداد ١٩٨٦ .

و پارچەیەك سوفی بەسەرەوە بەستووە، هەروا دەڵێن لیباسی خوری (سوفی) لەبەر کردووە[1].

چونکە بێ هۆ نیە بۆ کارێك گوزارشت لە پەرستن دەکا، ئەوا جل و بەرگێکی لەبەرە، ئەوە دەنوێنێ، بە واتا ئامارژەیە بۆ هەژاری بەویستی خۆی لە پێناو خودادا.

جا ئەمە گەلێ لێکدانەوەی هەیە، بگرە لە قوربانیەکانی ئیبراهیم پێغەمبەرەوە(ﷺ) ڕەنگە چەمکی گرتبێ و پەرەسەندنی ڕووکارانەی لەو فکرەوە هەبێ، لە پێناو قوربانی دان بە خود بە ڕێگای (باگنی)، چونکە ئەمانە لە بیردا لە یەك نزیکن و دەرکەوتنیان بەشێوازی تر دەشێ بێتەکایەوە.

دووەمیان: (ئەوەی پابەندە بە وشەکەوە) وە نەبێ بمانەوێ وشە و واژەکە لە کەسەکان دا بڕێنین، بەلاّم بۆ ئەوەیە زیاتر چەمکەکان لامان ڕوونببنەوە و مەبەستی ئامارژەکان بەدەرخەین، وەك گێڕانەوەیەکی مێژوویی سەبارەت بە ناوەڕۆك و زوهد زۆر مەسەلەمان تەی کرد، لەمەوە بۆ دەستەواژەی تەسەووف گەلێ بیروڕا هەن، جا ئەمانە هەر یەکەیان خاسڵەت و سیمای خۆیان هەیە چ بەهۆی ناوچەی جوگرافی یا باری تر.

وشەی (سۆفی) بە نیسبەتێك بۆ پۆشاك و جلوبەرگی خوری، سەرەتا ئامارژەمان بەوەدا کە جل و بەرگی کێ بووە!!! لە پێناو پاك ڕاگرتن و دوور کەوتنەوە لە باق و بریقی دونیا، ئەم وشەیە (بە کەسانێك وتراوە کە خۆیان لاداوە لە زەرقو بەرقی

---

١ – الشعر الصوفي، ص٣٤.

کۆکردنــەوەی ســامان و دروس کردنــی کۆشــك و تــەلار و هــەڵ خەڵـەتان بـە پلـەو پایـەی دنیـایی، وە هـەمووی کـاتی خۆیانیـان تەرخانکردووە بۆ خواپەرستی "ذکْر و فِکْر")[1].

لــەم ڕووەوە دەردەکــەوێ نیســبەتی وشــەی (صــۆفی) بــۆ (الصوف) وەك پۆشاکێك بێ، هەر لە مێژە سیپاڵی هەژاران و بێ نەوایان بووە، لەبارەی ئەو کەسەی ئەمەی پۆشیوە ئەوەتا هی نـەبوون بـووە ویسـتویەتی نـەبوون لـەم دونیایـە و هـەبوون لـە ئاخیرەت بێ، کەواتە خۆی بەزل نەزانیوە، وشەی (تصوف) وەك ئەوەی چاووگی فرمانی (تصوَّف)ەوە ئاماژەیە بۆ لەبەرکردن و پۆشینی خوری(سوف)، لەبەر ئەوە دەگوترێ (تصوف) ئەگەر بێتو خوری (سوف)ی لەبەر کردبێ، هەروەك چۆن دەگوترێ (تقمص) ئەگــەر بێتــو کــراس (القمــیص) لەبــەر بکــا، ئەمــە لــە خــودی (الصوف)ەوە هاتووە و تەواوی واتاکانی کە مامەڵەی پێ کراوە و، دەکرێ گوزارشت کراوە و ڕێرەوی بۆ دانراوە، چونکە بەفرەوانی چۆوەتە ئەم سنورە و چوار چێوەیە، (بەڵام سەبارەت بەوەی کە بۆچی بەم خواپەرستە پارێزکار و زاهیدانە وتراوە (صوفی) وە ئەم وشەیە لە کوێوە هاتووە ئەڵێم،.... بەر لە هەموو شتێ ئەبێ بزانین ئەم جۆرە ناوانە وەکو ناوی منداڵێك نیە هەر کە لە دایك بوو دایك و باوکی دانیشن وەناوی بنێن، بەڵکو هەروەکو زانیاری ی قورئان خوێندن پەیدا بوو وردە وردە ناوی قورئان خوێنەکان نراوە و پێ یان وتراوە (قُرَّاء)، یان کە حەدیسیان کۆکردوەتەوە بە

---

١ – تەصەووف چی یە ؟ ل١٠٦ و ١٠٧.

(مُحَدِّث) ناویان دەرکردووە، یان (فەقیە) وە بەم جۆرە، یان وەکو پیشە و زانیاری یە تازەکانی ئەم چەرخە کە هەر شتێکی تازە ئەدۆزرێتەوە ناوی پیشە و خاوەن پیشەکەیان ناوە و ناوی میکانیك و کارەبایی، وە تەیارەچی هاتوەتە ناوانەوە، وە دەستەییێك دانەنیشتوون تا ناوی کارناسی کارەبا بنێن (کارەبایی) جا هەر بەو جۆرەش بە شارەزای ڕێگەی شەرع وتراوە (فەقیە) وە بەوەی کە ئەروا حەج ئەکات وتراوە (حاجی)، بەوانەش کە لە کاروباری خواپەرستی دا شێوەی شەو نەخەوتن و شەو نوێژکردن وە خواپەرستی گەرم وە لە گۆشەییێکەوە بەکاروباری خواپەرستی یەوە سەرگەرم بوون وە خۆ نەپروکاندن بۆ ماڵی دونیا، وە باقی شێوەی خواپەرستی ڕاستەقینەی (زاهیر و باتین)یان گرتۆتە بەر، وە خواپەرستیەکەیان ، هەروا کە بە کردەوە ئەنجام داوە هەروایش لە دڵەوە خۆیان داوەتە دەستی خوا، واتە (تَوَکُّل) وە پەرەستشیان لە (ڕیا) پاك کردوەتەوە و سەرگەرمی زیکر و فیکر بوون بەمانەش وتراوە (صوفی)[1].

وەك ئامارژەمان پێدا هەر تەنها یەك وشە نیە بۆ سۆفییەکان، بەڵکو گەلێ وشەی تر داڕێژراوەتەوە و هاتونەتە کایەوە، ئەمە سەرەوە لە (سوف) خوری یەکێکیانە، لەو بارەوە گوتراوە وشەی تەسەووف: (لە (الصوفة)، لەبەر ئەوەی (الصوفي) لەگەڵ خوای گەورە وەك سۆفی لێك وەشاوەیە، لەبەر ئەوەی تەسلیمی خودای گەورەیە)[2].

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ل١٩٠ – ١٩١.

٢ – عبدالقادر عیسی، حقائق عن التصوف، ص ١١، مطبعة النواعیر، الرمادي – الطبعة الخامسة ١٤١٣هـ – ١٩٩٢م.

ئێمە لێرەدا وشەکانی دیکەش دەهێنینەوە کە ئەمانە لە کوێدا سەرچاوەیان گرتووە و کامەیان بە تەواوی گوزارشت لە خودی تەسەووف دەکەن.

هەروەها دەگوترێ کە هەندێ لەسەرچاوەکان دەڵێن: واژەی (صۆفی) بۆ (صافی) دەگەڕێتەوە، کە ئەمیش لە بنەڕەتدا (صفا)یە، بە واتا گوزارشتێکە لە پاکی و پاکیزەیی لە نهێنییەکان دا، ئەوەتا (أبو الفتح البستی) دەڵێ:

تنازع الناس في الصوفي واختلفوا
قدما وظنوه مشتقا من الصوف
ولست انحل هذا الإسم غير فتى
صفا فصوفي حتى لُقّب (الصوفي)[1]

ئەمە بەم شێوەیە ناونراوە، تایەفەیەك لەسەر ئەم بیروڕایەن کە (-الصوفیە- ناونراوە بە (صوفیة) لەبەر (صەفا) کە نهێنیەکانیان و پاکیی شوێنەواریان)[2].

لەبەر ئەمە پیاوچاکان و ئەولیاکان ئەمەیان زانیوە و لە ستایش و مەدحی سۆفی درێغیان نەکردووە، ئەوەتا لەم بارەوە (بشر بن الحارث) دەڵێ: (الصوفي لە پاکی (صەفا) دڵی ی بۆ خودا (هاتووە)[3].

---

١ – الشعر الصوفي، ص٣٤.

٢ – الكلاباذي، التعرف لمذهب اهل التصوف، ص٢٨.

٣ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٨.

بێگومـان ئـەوەی لێـرەدا جێگـەی سـەرنجە و پێویسـتە بـە گرنگـی وەربگـرین یـا ئـەوەتا لێکیـان کـە نیـە، وە دەبـێ بـزانین پیـاوانی تەسـەووف هـەبوون، ئینجا بەم نـاوە نـراون، ئـەم نـاوەش بـە تایبـەتی (صەفا) واژەیەکە زۆردوای واژەی (صۆفی) دەکەوێت، چونکە تـەنها لە ڕووی واتایەکەوە لەیەك لایەن دا پێی بەستراوەتەوە، لەبەر ئەوە ناچێتە عەقڵەوە کە (صـەفا) واژەیـەك بێـت بـۆ ناونـانی– سـۆفی– یـاخود ناونـانی ئـەو کەسـانە، ئـەو تایەفەیـەی تـەنها کاروباریـان خوداپەرستن، لەلایەکی ترەوە لە تـەواوی سەرچاوەکان بە (تصوف، صـوفي) نـاوبراوە ئـەوە جێگـەی گومـان نیـە، لـە سـاتێکا لـە ڕووی زمانـەوە، کـە ئەسـڵەن ئەمانـە لـە زمـانی عـەرەبی هـاتوون، وشـەی (صەفا) خۆی عەرەبی یە، لە ڕووی واتاوە ناگونجێ لەگەڵ (صوفی).

هەروەها وشەی (صوففە) یـاخود (صُفَّ) بەکارهاتووە، لەبـەر ئـەوە گوتویانـە (نـاونراون بـە (صـوفیە) لەبـەر ئـەوەی لـە ڕیـزی یەکەمن لەبەر دەستی خودای گەورەدا بەوەی کە دڵ و گیانیـان لای خـودای گەورەیـە، ئەمانـە قبـوڵن، بـە هـەموو نهێنیـەکانیان لەبەردەم خودای گەورە وەستاون)[1].

وە دەردەکەوێ لێرەدا ئەم ئاماژە خۆی دەنوێنێ کە ئەمانە واتە تایەفەی تەسـەووف لـە پێنـاو پەرسـتش و خوداپەرسـتی لـە ڕیـزی پێشـەوە بـوون، هـەروەها (لـە هـەموو سەرچـاوەکانا ئاشـکرایە کـە ئەصحابی (صـوففە) واتـە ئەصـحابە زۆر خواپەرستە بـێ نـەواکان، پۆشـاکیان هـەر خـوری بـوە، هـەروەها زۆرجـار لـە شـیعری مـەدحی

---

١ – التعرف لمذهب اهل التصوف، ص٢٨ – ٢٩.

خواپەرستانا هاتووە، کە لەبەربێ دەماریی خۆیان، هەر لیباسی خوری یان کردوەتەبەر یان لە لە زەممی دەس بڕەکانا هاتووە، وە وتراوە، کە پۆشاکی خوری ئەکەنە بەر بۆ ئەوەی بڵێن ئێمە زاهید وە خواپەرستین، کەواتە زۆر ئاشکرایە کە پۆشاکی صوف پۆشاکی بێ دەمار و، دووری گرتن لە زەرقو بەرقی دنیا بوە، بۆیە بوەتە ناوێکی هەمیشەیی بۆ ڕێبوارانی ڕێگەی تەسەووف)[1].

ئەمەش بۆ ئەوە هاتووە کە هەموویان لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) نزیك بوون، لەوسەردەمەدا نور و بەخششی پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتۆتە ئەوان و ڕیزی کردوون لە مەبەستەکانی خودای گەورەدا بەو پێیە هەمدیس بوونی وشەی (صەففە) و (صف) بەیانتواتیوە ببنە هێزێك و پێگەیەك بۆ دروست بوونی ڕێبازێکی گەورەی تەسەووف جا هەرچەندە لە ناو واتای تەسەووف بوونی هەیە، چونکە وەك ڕوومان کردەوە ڕاستە ئەمانە مامەڵەیان تەواو لە ڕیزێکە لەگەڵ بە یەکەوە وەستاون و ئەمەش لە پەرستشەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەسەرەتاوە بوونی هەیە، بەلام دەبێ بزانین لەلایەکەوە پاش دروست بوونی تەسەووف ئەمە زەق کراوەتەوە ئاخنراوە، لەلایەکی ترەوە بەهەمان شێوە لە زمانی عەرەبی گوزارشت لەواژەی (الصوفیة) و (الصوفي) ناکات، تەنها ئەوە نەبێت کە بۆ خۆی لەناو واتای مەزنی تەسەووف دا هەیە، کەواتە لەباری یەکەم دا لەناو واتای تەسەووف هەیە، نەك وەك ناوێك بۆی کە ئەمانەی کۆکردبێتەوە.

---

١ – تەصەووف چی یە ؟ ل١٩٢ و ١٩٣.

لـەبارەی (ألصـف) وە لـە نێـو دەسـتی خـودای گـەورە وا وەك سەرچاوەكان باسی لێوە دەكەن، كە لە ئەسڵدا ئەم ناوە (صـفوي) پـۆلی هاتۆتـە ئـاراوە و پاشـان بـۆ خـۆی واتـا كـەی سـەربەخۆیی راگەیاندووە و بووەتە (سوفی).

لـە تـەك ئەمانەشـدا بۆ سـۆفییەكان وشـەی (زُهَّـاد) بـەكارهاتووە، ئەگـەر بیرسـین چـۆن ئـەم وشـەیە هاتۆتـە نـاوەوە؟! ئـەوا دەزانـین لەلایەكەوە تەسەووف بە كەسەكان و تەقوا و پەرستشـە وە پابەنـدە، لەلایەكی ترەوە ناوهاتنی (زوهـد) زیـاتر بـە شـارێك یـا ناوچـەیەك یـا تایەفەیەك گرێ دراوە، چونكە (زوهـد) یـا (زُهَّـاد) ئەوانـەی چوونەتە دونیای زوهد، بێگومان لە ناوەرۆك دا جیاوازی لەگەڵ تەسـەووف دا نیـــە، لەبـــەر ئـــەوە لـــە رووی مـــەغزا و واتـــاوە زوهـــد تەســـەووف دەگرێتـەوە، بـەلاّم تەسـەووف گـەلێ لـە زوهـد فـرەوانترە و لـە پێنـاو پەرســتش دا زۆر رێســا و ئــەحكامی دانــاوە و هــەروەها تایبــەت نـەبووە بـە ناوچـەیەك، بـەڵكو گـەلێ ناوچـەی ویگـرە تـەواوی جیهـانی ئیسـلامی گرتۆتـەوە چ بـەهۆی ئاسـۆیی، واتـا تـەواوی ناوچـەكان چ بەهۆی ستوونی، واتا لە مێژوو و سەردەمە جیاوازەكان دا.

لەگەڵ هـەموو ئەمانـەش تەسـەووف پشـتی نەكردۆتـە كـەلتوری بەر لە خۆی و هەوڵی داوە هەموو ئەمانە لـە بـاوەش بگـرێ، لەمانـە (التقطـف) و زوهـد و عیبـادەت لـەم ئامانجانـەن، لەبـەر ئـەوە ئـەم واژەیــە دەكــرێ بڵــێین بــەكارهاتنی ســەرتاپاگیری نیــە، بــەڵكو ئەمەشـیان پـێ گـوتراوە، كەواتـە (صـۆفی) پـێش (زُهَّـاد) كـەوتووە ئەمەش رێ لەوە ناگرێ ناوی تریان پێ بگوترێ، لە ساتێكا دیـارە (صـۆفی) سـەرتاپاگیری بـووە، بـەلاّم (زُهَّـاد) بـەم شـێوەیە نیـە، و بەكارهێنانی سنووردارە.

بەوتایەفەی کە (سۆفین) پێیان وتراوە (فُقَراء) بەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیە، وە نەبێ لەجیاتی خودی تەسەووف و سۆفی بێت، بەڵکو لایەنێکی لێ وەدەرخستون، بەجۆرێ بەتەنگ سامان و ماڵ و موڵکی دونیاوەنین، بەڵکو ئەگەر بێتە دەستیان بە موڵکی خۆیانیان نازانن، کەواتە هاوکێشەیان لەوەدایە هیچ شتێکی لەم گەردوونە بە موڵکیان نازانن، لەبەر ئەوە (ئەوانەی خەیاڵیان بەلای موڵکیان دا چووە ناویان ناون هەژارەکان (فقراء) گوتراوە بەلای هەندێکیانەوە لە(الصوفي)دا گوتوویانە: ئەوەی هیچ موڵکی نەبێ و هەروا موڵکیش بەلایەوە نەبێ، بە واتا تەماعی ڕووی تێ نەکات)[1].

هەروەها پێیان گوتراوە (غُرَباء) دەشێ ئەمەش بۆ ئەوە بگەڕێنینەوە کە لەوساتەی بەها دونیاییەکان ئامادەگییان هەبووە، ئەمانە خۆیان لەوانە دوورە پەرێز گرتووە، لە حاڵەتێکا ئەوەی بەسەر سۆفییەکان دا زاڵ دەبێ بەردەوام شار و شار و گوند بۆ گوند گەڕان و هەرگیز ئەوەی لە ناخیان دا هەبووە دەست بەرداری نەبوونە، ڕەنگە بزانین ئێستا جیاوازی هەبێت لە وشەکان دا، جیاوازی هەبێت لە دەستەواژەکان دا، کە هەندێکیان گوزارشت لەوە دەکەن چۆن گەیشتووە بە (صوفی) هەروا هەندێکی تریان ئەوە دەخەنە ڕوو لە تەك وشە و واژەی (صوفی) واتای تریش بەکارهاتووە، بەر لە هەرشتێك ئەم واتایانە بەشێکی لە واتا گشتی یە کە دەگرێتەوە، نە وەك بکەوێتە ململانێ و ببێتە جێگیری سەرتاپای وشەکە، لەبەر

---

[1] – التعرف لمذهب اهل التصوف، ص٣٠.

ئەوە مەسەلەی لەم واژانە زیاتر لە خزمەتی وشەی سەرەکین ئەویش خۆی لە (صۆفی) دەنوێنێ، چ لە بابەت کەسەکان، یاخود لە بابەت وشەکەوە هەمدیس واژەی (غُرباء) تایبەتە بە سەردەمێك ئەگەر لەناوچەیەك نەبێت، ئەوا سنوورەکەی فرەوان نیە و دوای وشەی (صوفی) هاتۆتە ئاراوە، لەم حاڵەتەوە وشەکە زیاتر دەوڵەمەند بووە، بۆ فرەوانکردنی مەغزاکەی.

ڕەنگە بۆ خودی وشەی (صوفی) دوای ئەوەی سەرتاپا جیهانی ئیسلامی گرتۆتەوە، لەناوچە جیا جیاکان دا مەرج نیە لەسەرەتا بۆ عیبادەت و پەرستش ئەم ناوە چرۆی کردبێ، هەروەك (زوهد)ی بەسرە، لەمەوە سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن ئەو تایەفەی لە خوراسان پشتیان لە دونیا کردووە و هەمیشە خەریکی پەرستش و خودا پەرستی بوون، بەردەوام چوونەتە ئەشکەوت و پەناگا و غارەکانی ئەو ناوچەیە، خۆیان دوور خستۆتەوە لە تنۆکێك گوناح، چونکە لە کۆمەڵگادا گوناح بەرجەستە دەبێ، لەمەوە لە شارو گوندەکان دانەنیشتوون، بەڵکو بۆ چیاکان و شوێنە دوورەکان لە خەڵك سەریان هەڵگرتووە، لەبەر ئەوە چوونەتە نێو ئەشکەوت، لە وێدا خەریکی خوداپەرستی بوون، بۆیە لە خوراسان بەم تایەفەیان گوتووە (شکفتیة) لەبەر ئەوەی (شکفت) یانی ئەشکەوت، لەمەوە شوێن ڕۆڵی کاریگەری هەبووە بۆناو بردنیان، دیارە ئەم ناوە تایبەتە بە ناوچەیەك، ئەگینا خودی مەغزاکانی تەسەووف سەرتاپاگیری یە و لە هەموو ناوچەکان وەك یەك وایە، ناو هێنانیان بە (الشکفتیة) هەمدیس سنووردار و چوارچێوەی بۆ دانراوە، لە حاڵەتێکدا ئەمە دیسان بۆ خۆی واتایەکی نزیك لە وشەی (فقر) و

(غُرباء) دەخاتە زەینمانەوە، ڕەنگە بۆناو هێنانیان بەرلەوەی بەم شێوە فرەوانە بڵاوبێتەوە بە گوێرەی ناوچە و باروودۆخ هاتۆتەکایەوە، بەڵام کاتێ تەسەووف بۆوەتە بزافێکی فرەوان و سەراسەری هەموو ئەم وشانە پوکاونەتەوە لە ڕۆڵی سەرەکی و واتای وشەی (صوفی)یان دەوڵەمەند کردووە.

هەروەها لە تەك ئەمانەدا لە وڵاتی شام دا یاخود ئەهلی شام بە ئەوانەی خەریکی تەسەووفن گوتوویانە: (الجوعیَّة)، دیسان وشەیەك دێتە ئاراوە" کە بۆ خۆی دەیەوێ گوزارشت لە بەشێك بکا، یاخود گوزارشت لە ئەزمونێکی درێژ و تەواوی ژیانیان بکا، چونکە پیاوانی تەسەووف ئەوەندە ناخۆن تێربن، ئەمان بە تێر نەبوونیان زیاتر گیانیان تێر دەکەن، چونکە دەزانن ئەم ڕێگایە بەرەو هەڵدێریان دەبات و لە دوو دڵی و گومان و دڵەڕاوکێ یان نزیك دەخاتەوە، ئەگەر (الجوعیّە) بەهەر جۆرێ برا ئەوا لە تەسەووف ئادابێکی ڕێك و پێکی بۆ دانراوە کە لە زانستی تەسەووف بە گشتی و لە تەریقەتەکان ڕێنمایی بۆ دانراوە، ئەمانەی دوایی بە واتا (زُهَّاد- فُقراء- غُرَباء- الشکَفْتیة - الجُوعیَّة) هەموویان بۆ خۆیان کۆمەڵێ دەستەواژە دەگرنەوە، دەکرێ بەیەکەوەش لە تەسەووفدا هەبن، بەم هاوکێشەیە دەردەکەوێ کە تەسەووف بە تەنیا لەمان فرەوانترە، هەرچەندە گەلێ ناوی تریشیان لێ نراوە، بەڵام (بۆچی بوە؟ چونکە صۆفیەکان خاوەنی هەمووی ئەم پێناسانە بوون پشتیان لە دنیا هەڵکردووە، کەواتە زاهیدان، ماڵ و سامانیان پێکەوە نەناوە ئەگەر ماڵیشیان بوبێت بە هی خوایان زانیوە، وە خۆیان بە موحتاجی خوا زانیوە پێ یان وتراوە(فەقیر)، هەمیشە

جیهان گەردیی یان کردووە پێیان وتراوە(غورەباء)، لە ئەشکەوت و بن بەردەکانا سەرگەرمی خواپەرستی بوون بۆ ئەوەی کە دووربن لە هەراو مەزات و قاڵە و سمڕ، پێ یان وتراوە(جوعیة)، وە زۆرتری پۆشاك و سیپاڵیان لە خوری بووە، واتە (صوف) پێیان وتراوە(صوفی)، وە چونکە زاهید یان عابید یان غریب یان فەقیر بگرە هەر کامەی پێناس بوبێت بۆ بەشێك لە حاڵ و ئەحواڵی(صوفی) کەواتە کام وشە توانیبێتی بەسەری ئەوانی ترا زاڵ بێت، وە هەموویان بگریتەوە، ئەوە ماوەتەوە ئەویش بریتی یە لە جلوبەرگ و سیپاڵ، بێگومان هەمووی ئەمانە لەبارەی جلوبەرگەوە کۆشیون بەرگی سادەتر و بێ زەرقوبەرق تر بکەنەبەر، کە ئەویش هەر سیپاڵی خوری بووە، کە بە عەرەبی بوەتە (صوف)، وە وشەی (صوفی)ی بوەتە ناوێکی هەمیشەیی بۆ هەموو سۆفی مەسلەکێك، چونکە هەمووی ئەوانە لەو بەرگەدا بەشدار بوون)[1].

خودای گەورە لە قورئاندا ناوی تایەفەی خێر و چاکە خواز و چاکەساز و پەسەندی بە (قوم ابرار) و (مقربین) و (الصابرون) و (الصادقون) و (الذاکرون) و (المُحبُّون) بردووە، کە ناوی سۆفی خۆی لەمانە دەدۆزێتەوە و سەر هەڵدەدا، چونکە دیارە وشەی سۆفی ساتی خۆی هەیە بۆ سەرهەڵدانی و گوزارشتەکانی بەدەرکەوتوون، بەڵام نموونەکان لەبارەی ڕووداو و کەسەکان و وشەکان زیاتر بەرەو یەقینمان دەبەن، کە لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە و چۆن هاتۆتەکایەوە؟!!.

---

١ - تەسەووف چی یە ؟ ل١٩١.

نەك هەر ئەم ناوانە بگرە (أبونعيم الأصبهاني) بۆ (الصوفانة) لە ڕووەکەوە گەڕاندوویەتیەوە، هەروا بۆ (صوفة القفا) کە چەند تاڵێکە لەو ڕووەکەدا، کە ئەمانە ڕوونکردنەوە بۆ ئەوەی لایان کردۆتەوە بە نەشاردنەوە و (تەوازوع) و پشت کردنە دونیا.

هەروا (أبو ريحان البيروني)(٤٤٠ ك) مردووە، بۆ ئەوە چووە کە (الصوفية) لە وشەی یۆنانی (فیلاسوفا) بەواتا خۆشەویستی حیکمەت وەرگیراوە، کاتێ هاتە ئاراوە کە موسڵمانەکان پاش سەدەیەك زانست و مەعریفەکانی دەوروبەریان ناسی، بەتایبەتی یۆنانیە کۆنەکان.

ئەمەش لەلایەن هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسان قۆزراوەتەوە، کە (البيروني) لەو سەردەمەدا درکاندوویەتی (کاتێ لە ئیسلام دا قەومێ چوون و لە نزیك ڕاکانیان نزیك کەوتونەتەوە بەناویان نراون)[1].

بێگومان مەبەستی لە (فیلاصوفیا)ی یۆنانی یە کە لایان پەرەی سەندووە، هەتا ئەمە وایکردووە ڕۆژهەڵاتناس (فون هامر) ئەوە بهێنێتەوە کە وشەی (تصوف) و (صوفية) لە وشەی (Gymnosopnists) (جینوسوفیا) وەرگیراوە، واتای (تەنها حیکمەت) کە یۆنانیەکان ئەم ناوەیان لەو هیندیانەوە کە سەراپای ژیانیان لە گەڕان بەدوای خودا خەریك کردووە کە ڕامانیان لەوبارەوە بۆی هەبووە، بەڵام بیروڕایانە لەگەڵ سەرچاوەی وشەی (صوفی) دوورن، چونکە لە قووڵایی کۆمەڵگای ئیسلامەوە (تصوف) سەری هەڵداوە دیارە وشەکە لە (الصوف)ەوە هاتووە کە سەرەتا بەو

---

١ – الشعر الصوفي، ص٣٥.

موسڵمانە زاهیدانە وتراوە کە بوونەتە خاوەنی خودی پەرستش، (ئەمانە بەو موسڵمانە زاهیدانە گوتراوە، لەسەرمان پێویستە ئەوانی تر هەموو بەرپەچ دەینەوە و تەنها ئەم گوتەیە نەبێ)[1].

بۆیە پۆشاك و سیپاڵیان ناوەوەیانی دەرخستووە، هەتا سۆفی کە ئەم جلەی لەبەر گرتووە بەردەوام یادو زیکری خودا جێ نەهێشتووە و تەواوی جەستەی گرتۆتەوە، لەلایەکی ترەوە لە ڕووی ڕێزمانەوە لە زمانی عەرەبی دا بێجگە لە (صوفي و تصوف) هیچ شتێکی تر قبوڵ ناکا و وەرناگرێ و بەهەڵە دەکەوێتەوە، (بەلاّم زۆرتری سەرچاوەکان وەکو کتێبی(اللُمَع) هی (ابونصر سراج) کە لە(٣٧٨) کۆچی دا کۆچی کردووە، هەروەها تا ئەگاتە سەری (دکتۆر زەکی موبارەك) لە چەرخی خۆمانایە، هەموویان لەسەری ئەو باوەڕەن کە سەرچاوەی ئەم ناوە، هەر ئەگەڕێتەوە بۆ سەری لەبەرکردنی پۆشاکی هەژارانەی خوری، کە تا ئەم دواییە پۆشاکی هەژاران و بێ دەماران هەر لە خوری بووە، وە دوری یان گرتووە لە پۆشاکی حەریر و ڕەنگا و ڕەنگ، ئەگەر بڵێم سەبارەت بەم ناونانە، شتەکە بڕاوە نەبڕاوەتەوە، بەلاّم ئەمەیان هەم لایەنگری زۆرەو، هەم لە هەمویشی زیاتر هەڵدەگرێت، بەتایبەت لە ڕوانگەی (قەواعیدی زمانەوە) بەتایبەت هەرلەبەر ئەوەش کە بەناوبانگە پۆشاکی پێغەمبەران زۆربەی هەر خوری بووە)[2].

---

١ – الشعر الصوفي، ص٣٠.

٢ – تەسەووف چی یە ؟ ل١٩٢.

جا لەبارەی وشەکەوە دەبیٚ ئەم سەرنجەش بە هەند هەڵبگرین، کە بۆخۆی لەگەڵ پیٚناسەکەشی تیٚکەڵ دەبیٚ، کە بابەتەکانی لیٚك جودا ناکریٚنەوە، بەڵام کیٚشە وگرفت لەسەر خودی وشەکە، تەنها بە وشەکە بەند نیە، بەڵکو بە تەواوی زانستی تەسەووفەوە لکاوە، ئەمەش پەیوەندی بابەتی تەسەووف نیشان دەدا، لەمەوە دەزانین وشەکانی تریش لە مەڵبەندی وشەی (صوفی) سەرهەڵدەن کە (سەیرتر لە هەمووی ئەوەتە فارسەکان بە (صوفی)یان وتووە (پەشمینە پوش) واتە (پەژم) (خوری) پۆش، واتە وشەی (صوف)ەکەیان بە پەشم داناوە، وە (حافظی شیرازی) زۆر جار لە شیعرەکانی بە صۆفیەکان ئەڵیٚت: "پەشیمنە پۆش")

(پشمینەپوش) تندخو از عشق نشنید ست بو
از متیش رمزی بگو تا ترك هوشیاری کند [1].

هەرچەندە لە زەمانی (صحابة) و بگرە دواتر بەکار نەهاتوون، دەکریٚ ئەم پرسیارەش بکەین، گەلیٚ لە زاراوەکان یاخود زانستەکان لەو سەردەمەدا نەبوون، ئەوەتا دوای ئەوان گەلیٚ لەمانە بەکارهاتوون و سوودی گەورەیان هەبووە و کەسیش ئینکاری لیٚ نەکردوون وەك (نحو والفقه والمنطق)، وەك دەرکەوتووە تەسەووفیش وەك یەکیٚ لە زانستەکان ڕۆڵ و کاریگەری فرەوانی هەبووە.

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ل١٩٢.

# پێناسەی تەسەووف

زانینی تەسەووف یاخود ناساندنی بابەتێکی زۆر قورسە، لەبەر ئەوە ناتوانین بە تەواوی و پڕ بە پێستی مەعریفی بیناسین، سەرەڕای فرەوانی، چونکە پێناسەی خودی تەسەووف بە جۆرێ هاتۆتەکایەوە کە تیایدا لە زۆربەی بەشەکان پێناس کراوە ئەمە لەلایەك و هەروەها لەلایەکی تردا دەبێ بزانین بەردەوام تاکو ڕۆژگاری زوویش لەلایەن ئەولیا و شێخ و گەورە پیاوان پێناسەکراوە، لەمەوە زانستی تەسەووف چەندەها پێناسەی لە خۆ گرتووە، لە ڕاستیدا ڕاڤەکردنی تەواوی پێناسەکان گەلێکی دەوێ، سەرەڕای پەیوەندییان بە بارێکەوە چ لە ڕووی وشە و زاراوە و حاڵ و مەقام و... هتد بێت، وەك باسی لێ دەکەن تەنها پێناسەکانی تەسەووف خۆی زیاتر لە هەزار پێناسە دەدا[1].

بەرلەوەی پێناسەی تەسەووف بکەین لایەك دەکەینەوە بەوەی: ئایا دەبێ شەرعییەت بۆ ئەم زانستە هەبێ لە کاتێکا لە قورئانی پیرۆز ناوی نەهاتووە؟!.

ئەمە خۆی لە خۆیدا پرسیارێکی جەوهەری یە و وەڵامی دەوێ، لەبەر ئەوە وەنەبێ ئەمە هەر پرسیار بێ، بەڵکو گەلێ لەوانەی ویستویانە تانە و تەشەر لە زانستی تەسەووف بدەن گوتوویانە

---

[1] - بکر سید عبدالرزاق محمد السامرائي، قواعد الأخلاق في التصوف الإسلامي، ص٢٩، ط ١ - بغداد - ٢٠٠٠م.

وشەی تەسەووف لە قورئان باسی نەکراوە؟! وە هەروەها لەسەر زمانی(پیرۆزی) پێغەمبەریش(ﷺ) نەهاتووە، لەبەر ئەوە تەسەووف بیدعەتە، هەروا ئەوانەی ڕێگەی خودایان گرتۆتە بەر ئەوا لە ئاین دەرچوون، بۆ وەلأمدانەوەی ئەم تایەفە ئایاتە و لۆژیکەی ئەوان باسیان کردووە" ئایا لۆژیکێکی بەهێزە!!! بێگومان لۆژیکێکی لاوازە، چونکە هیچ حیکمەت لە قسەکانیان دا نیە، و لەسەر بنەمای پڕو پوچ و دژی پێشکەوتن بنیادنراوە، لەسەرەتاوە دەپرسین ئایا چ بەڵگەیەك بۆ ئەم بیروڕایەیان هەیە؟! ئایا حیکمەت و عەقڵ چی یە لەم تێزەیان!! هەر چۆنێك بێت پیاوانی تەسەووف پیاوانی ڕێگەی حەقیقەتن، لەگەڵ ئەوەی زاراوەی تەسەووف لە قورئانی پیرۆزدا نەهاتووە، هەروەها لە زانستی حەدیسیش نەهاتووە، بەلأم ئایا ئەوە ڕێگەمان پێ دەدا بڵێین ئەمە بیدعەتە؟!!، گەر لە زانستەکان بڕوانین کە سوودی زۆریان بە مرۆڤایەتی و خودی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و کۆمەڵگای ئیسلام گەیاندووە، ئەوا ناویان نەهاتووە نە لە قورئان و نە لە حەدیسەکان دا، کەواتە ئایا پێویستمان بە زانستی (فقە) هەیە یان نا؟! کە ناوی نەهاتووە، گومان لەوە نیە گەلێ زانستی تر ناوی نەهاتووە، زانستی (فقە) لە کاتێکدا هاتەکایەوە کە موسڵمانەکان زۆر پێویستیان پێ هەبوو، هەروا (محمد المصطفى ﷺ)یش فەرمانی پێ نەکردووە، بەلأم کۆمەڵگای ئیسلام و پەرەسەندنی ئاین و کۆکردنەوەی بیروڕاکان لە ژێر سێبەری شەرع ئەمەی هێنایەکایەوە، و هەروا (فقە) گەلێ پەرەی سەند و ئەوانەی لە (فقە)دا دەستی بالأیان هەبووە و بوونە بناغەی دروست بوونی ڕێنماییە ئاینیەکان لە کۆمەڵگای ئیسلام دا لەگەڵ

ئەمەش ناوی لە قورئان دا نەهاتووە و لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) بوونی نەبووە(زانستی فقە واتە: تێگەیشتن لە قورئان و فەرموودە وە هەڵێنجانی حوکم لێیان، ئەگەر لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم کارە نەبووبێ ئایا دواتر زانایان لە کێ فێربوون ئەم کارە؟!!) (پێویستە بەم نووسراوەی ڕابردوودا بچیتەوە و وردتر بیری لێ بکەیتەوە و جوانتر وەڵام بدەیتەوە)، ئایا نابێ زانستی (فقە) هەبێ، لە ڕاستیدا نەبوونی زانستی (فقە) کەلێنێکی گەورەی دەخستە کۆمەڵگای ئیسلامی، ئایا ئەمە بیدعەتە و دەکرێ بە بیدعەت باسی بکەین!!؟ هەروا لەگەڵ بەهەمان شێوە لەگەڵ زانستە شەرعییەکانی تریش ڕووبە ڕووی ئەو هەڵوێستە دەبینەوە و ئەمانە باس نەکراون، چونکە موسڵمانەکان پێویستیان بە زانستەکان هەبووە، بۆیە لە کات و ساتی خۆیدا" لە زەمەن و شوێنی خۆیدا بەگوێرەی پێویستیەکان ئەرك و مافەکانیان دەست نیشان کردووە، لەکاتێکا دوای فەتحی ئیسلامی و بوونی ڕەگەزەکانی تر بە ئیسلام و فرەوانی کۆمەڵگای ئیسلام ئەمانە بارێکی پێویستی بوون، هەروا کۆکردنەوە و پێشخستنی زانستی حەدیس و ڕێکخستنی مەسەلەکان و نووسینەوەی وتەکانی(فەرموودەکانی) پێغەمبەر(ﷺ) بەگوێرەی کات و سات و لە زەمانی (ئەصحاب و تابعین)دا و لێك هاوێرکردنیان دوای ئەمە" لەم هۆکارە گرنگانە وایان کرد کە زانستی (فقە) بێتە کایە و لە ورد و درشتی ئەحکامەکان بکۆڵێتەوە و بزانێ چەمان پێشکەش دەکا دوای دەقەکان، بۆ ئەوەی بە دروستی و ڕێك و پێکی عیبادەتەکان جێ بەجێ بکەین، بۆئەوەی موسڵمانان مافی خۆیان و ئەرکەکانیان لە

بەرامبەر شەرع دا بزانن، هەموو فەرز و تەکلیفەکان جێ بەجێ بکەین، تاکو نەکەوینە خراپە و بەدکاری، جا لەمەوە چ پێویستی مەزن هەیە بۆ بوونی زانستی(فقە).

بێگومان تەسەووفیش هەمان ڕێچکەی گرتووە، لێرەدا گرنگ نیە کەی سەری هەڵداوە؟ وەك دیارە (فقە) هەیە بۆ فەرعەکان، ئەوا تەسەووف فیقهی ئوصولە، لەبەر ئەوە تەسەووف فیقهە بۆ دڵەکان، بۆیە ئوصول بە تەواوی نابێ ئەگەر بە فەرعەکان نەبێ، لەبەر ئەوە موسڵمانەکان بەپێویستی بۆیان دانرا، و کۆمەڵگای ئیسلام لە قووڵی چ لە ڕێی سیاسی و کۆمەڵایەتی لایان لە قووڵی پەرستش و هەقیقەت لە خۆیدا کرا، ئەمانەش کۆمەڵێ زوهاد و زانا و گەورە پیاوانی تەسەووفی لە خۆ کۆکردەوە، لەسەر کەلتوری مەزنی ئیسلام دا، تاکو مرۆڤی موسڵمان ئەو لایەنە ببینی لە بەهێزی باوەڕدا، وەك چۆن ڕێگای ژیانیان و ڕەفتاریان تەنها لە پەرستش دا چڕکراوەتەوە، بەڕێگای (محمد المصطفی ﷺ) دەروونیان ڕووناك بۆتەوە و خودای گەورە لە وەسفی ئەمانەدا فەرمووی: ﴿ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾[1]، هەروا فەرموویە: ﴿ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ ٦٤ ﴾[2]، ئەمانەن موژدەیان دراوەتێ بەهۆی پەرستش و پاکیان ژیانیان تەواو ڕۆشنە و درەوشاوەیە جا چ لە دونیا یا قیامەت بن.

---

١ – سورة البقرة، الآية ٢٥.

٢ – سورة يونس، الآية ٦٤.

لەلایەکی ترەوە ئەوانەی خەریکی (زانستی حەدیسن) تایبەتمەندی ئەم زانستە دراوە بە گێڕەرەوەی حەدیس و کۆکەرەوەی، هەروا زانستی فیقە، زانا و عالیمەکان تایبەتمەندن لێی، ئەوا زانستی تەسەووفیش سۆفییەکان لێی تایبەتمەندن، ناتوانین بڵێین کە خاوەنی گێڕەرەوەی حەدیس و کۆکەرەوەی ئەوا تانە لە بیروڕای فوقەها بدەن، هەروەها فوقەها ناتوانن تانە لە کۆکەرەوە و گێڕەرەوەی حەدیس بدەن، چونکە هەر یەکێ لەمانە بەکاری خۆیان تایبەتمەندن، هەروا بە نیسبەت عالیمەکانیش هەروایە، لەبارەی سۆفییەتیش ئەوا چونکە ناتوانرێ تانە لە سۆفییەت بدرێ، تەنها دەتوانن لێوەی بدوێن کە گەیشتبن بە پلەوپایەی دڵ و درەوشانەوەی، ناتوانن باس لە زانستی بکەن، تاکو خۆیان نەگەیشتبن بەو پلە بالأیەی هەیەتی، ئەم بنەمایە گرنگە بۆ ئەوانەی دەیانەوێ تانە و تەشەر بدەن.

لەبەر زۆری پێناسەی تەسەووف و بوارەکانی دا لێکۆڵەرانی تەسەووف ویستوویانە چارەسەرێکی بۆ بدۆزنەوە" دابەشی بکەن بەسەر چەند قۆناغێکدا بۆئەوەی دەستیان بەسەردا بشکێ و لەبەر بەرفرەوانی پێناسەی تەسەووف لایەنەکانی جودا بکەنەوە، لەدوای ئەم تێڕوانینەدا لێکۆڵەرانی زانستی تەسەووف لەسەرهەڵدانی تەسەووفیان ڕوانیوە وەك سێ قۆناغ، لەمەوە بۆ هەر قۆناغێك پێناسەیان داناوە، واتا دەست نیشانکردنی پێناسەکان" بە واتا هەموو پێناسەکانی قۆناغی یەکەم لەوەوە دەست نیشان کراون کە لەم زاراوانە کۆدەبنەوە، لەبەر ئەوە پێناسەی تەسەووف لە (قۆناغی یەکەم)ی بەسەر ئەمانە دابەش

دەبێ: لەتبوون و پەرستش و پاکێتی، هەروا لە (قۆناغی دووەم)دا بریتییە لە لەتبوون و مەعریفە و دوور لێ خستنەوە، هەروا لە (قۆناغی سێیەم)دا بریتییە لە لەتبوون و مەحەبەت و فەنا[1].

لێرەدا کۆمەڵێ پێناسە دەخەینە ڕوو کە ئەولیا و گەورە پیاوانی تەسەووف کردوویانە، ئەمانەش گرنگی تایبەتی یان هەیە لە ڕێگەی خودی پیاوە گەورەکانی تەسەووف دا، دەکرێ بڵێین ناساندنی تەریقەتەکەیانە، بەڵام زۆر پێناسە هەن لایەنی تر لە زانستی تەسەووف دەگرنەوە، لەمەوە پێناسەکان جۆریان دەردەکەوێ هەندێکیان دەخەینە ڕوو:

(شێخ جنید)ی بەغدادی گەلێ تاریفی تەسەووفی هەیە، لەوانە:

- تەسەووف: (ئەوەیە کە هەق دەتمرێنێ تیایدا و بەوە زیندووت دەکاتەوە). بە واتا هیچ جوولە و بزافێك بەتۆوە نیە، و لە تۆوە دەست پێ ناکا بەڵکو هەمووی هەرچی هەیە هەق تیایدا زاڵ دەبێت، لەبەر ئەوە هەموو بزاف و جوولەیەك نابێ بەبێ نییەتی (نییەت بۆ) خودای گەورە.

- تەسەووف: (واتا لەگەڵ خودای گەورەدا بەبێ پەیوەندی)(یان نێوەند). دەبێ لەو حاڵەتەدا چەند لە پەرستشەکان نزیك بینەوە، بێگومان نزیکبوونەوە و دوور بوون نامێنێ، چونکە هەر بەرەو نزیکبوونەوە و نزیکبوونەوەی زیاتر هەوڵ دەدەین، ڕێبوار ئەمەیە هەموو مەسەلەیەکی، ئەویش جیهاد لە ناوەوەدا، بەواتا بەبێ هیچ مەبەستێکی دنیایی و قیامەت، بەڵکو بەرەو خودا دەبێ تەنها بۆ خودا خۆی.

---

١ - هەمان سەرچاوە، ل٢٩.

– تەسـەووف: (زیكـر لەگـەڵ كۆبـوون، وەجـد لەگـەڵ بیسـتن، و كـار لەگـەڵ پـەیرەوی لێ كـردن)[1]. بـە واتـا زیكـر كـردن لەگـەڵ ئامـادەگی دڵ و دەروون پـاك بێتـەوە و زیكـر بـەردەوام هـەبێ و پاشـان وەجـد بێتـە نـاوەوە و بـۆ كـاریٚ بیهـاویٚ و دەروون تیایـدا پەرستش بە دەسەلأت بێ و رێڕەو هەبێ.

– تەسەووف: (سۆفی وەكو زەوی وەهان، كە هەزار شتی ناپاك بخەیتە سەر، ئەو جگە لە شتی پاك هیچی لێ ناڕوێت، وە هیچ دەرنادات)[2]. (ئەمە پێناسەی سۆفی یە نەك تەسەووف)

كەواتە هەر چۆنێك بێت تەسەووف هەڵگری پەیامی پیرۆزە و تەنها پاكێتی هەڵگری و دەیداتەوە.

– تەسەووف: (بریتی یە لە پاكردنەوەی دەرون بە چەشنێك كە هەرگیز ناپاك نەبێتەوە"ناپاكی بۆ نەگەڕێتەوە"، وە هەرگیز زەبونی و لاوازی ڕوی تێ نەكاتەوە، بە چەشنێ بۆ هەمیشە لە خووخدە "حەیوانی"یەكانی مرۆڤ دەس بەرداربێت، وە ئاگری"بەشەری یەتی" بكوژێتەوە، وە دوریی بگرێت لە ئارەزوی"نەفس" وە نزیكی بكات لە ئارەزوی"ڕۆحی"، وە دڵ بدات بە زانیاری ڕاستەقینە "مەعنەوی" وە هەتا هەتایە جگە لە چاكە هیچ كردەوەیێكی نەبێت، وە ئامۆژگاری چاكەی هەموو كەسێ بكات، وە پەیرەوی بكات لە ڕێڕەوی ئیسلام ڕێڕەوی پێغەمبەری گەورە ﷺ)[3].

١ – الرسالة القشيرية، ص٢١٧ – ٢١٨.

٢ – تەسەووف چی یە ؟ ل٨٣.

٣ – تەسەووف چی یە ؟ ل٧٧.

ڕوونە پلەکانی چلۆن ماوەتەوە بۆ مانەوە لەسەر پاکێتی و لەو پلەیەدا چی دەگەیەنیٚ!!! دەبیٚ بگەڕێتەوە بۆ مەسەلە ڕوحیەکان و ئەمانە بەسەر خۆی دا زالٚ بکات، چونکە تەسەووف بریتی یە لە "زانیاری خواناسی" واتە "دلٚی زانیاریەکان" کە هەموو شتیٚ بەجیٚ دەگەیەنیٚ چ لەسەر ئەم زەویە و چ لە ئاخیرەت.

ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا ﴾[1].

ئەمەش زانیارییەکی دەروونی و پڕە لە بەخشین دەبیٚ لە دەروون دا هەموو شتێکی پەسەند جیٚ نشین بکریٚ لەبەر ئەوە خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾[2].

- تەسەووف: (سۆفی وای لیٚ دیٚت هەرچی جولانەوەیێکی بەوجۆرە ئەبێت کە خوا پێی خۆشە، وە هەرگیز سەرپێچی ناکات لە فەرمانی هەق، بە چەشنێك هەستی لاڕیٚ گری خۆی ئەکوژێت، وە هەتا هەتایە لەناو هەستی فەرمان بەرداریدا ئەمێنیتەوە)[3].

---

١ - سورة البقرة، الآية ٢٦٩.

٢ - سورة الجمعة، الآية ٢.

٣ - تەسەووف چی یە ؟ ل٧٧.

تەسەووف گۆڕینی ڕەوشی مرۆڤ کەراییە لەبۆ ڕەوشی خودایی، تەنها بەهۆی ڕێگەی تەسەووفی ئیسلامیەوە دێتە کایەوە.

- تەسەووف: (صۆفیەکان پەیوەندیان تەنها لەگەڵ خودایە، وە جگە لە خوایش کەس نایان ناسێت)[1].

لەلای (شێخ جونەید)ەوە بۆمان دەرکەوت کە پەیوەندی لەگەڵ خودا چلۆنە، چونکە تەسەووف بەو ئامارژە دەدا کە خودا هەرچی پەیوەندت هەیە لەگەڵ (نەفسی) خۆتابی بڕێت، وە پەیوەندت بدات بە خۆیەوە، (لەگەڵ خۆتا) بتمرێنیٚ وە لەگەڵ خۆیا زیندوت کاتەوە.

- تەسەووف: (بەکارهێنانی هەموو ڕەفتارێکی سونی یە و پشت کردن لە هەموو ڕەفتاری بەدە)[2].

هەروەها (ابی الحسین النوری) لە پێناسەی تەسەووف دا دەڵیٚ!.

- سۆفی: (نیشتەجیٚ بوون لە کاتی عەدەم و نوکرانی خود لە کاتی وجود)[3].

بە واتا ئارام بوون و بیٚ دەنگی و تەسلیم بوون بە قەزا و قەدەر و پشت لە ئارەزووەکان و ئەوانەی خود بەدەردەخەن و (نەفس) زاڵ دەکەن.

- سۆفی: (کیٚ بیستنەکان ببیستیٚ و هۆکارەکان کاری تیٚ بکەن).

بەجۆریٚ مەبەست لە بیستن نزیك بوونە لە مەحبەت و دەبیٚ ئاگادار بیٚ و لە مەنزیك بیٚ و بە قەزا و قەدەر تەسلیم بیٚ.

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٨٣.

٢ - عبدالقادر عیسی، حقائق عن التصوف، ص٩.

٣ - قواعد الأخلاق في التصوف الإسلامي، ص٣٠.

- سۆفی: (خێڵـێکن کـە دڵیـان گسـك دراوە لـە زیانـەکانی ئادەمیزادیەتی، وە لە ئافەت و نەخۆشی (نەفس) چاك بونەتەوە، وە لـە دەس ئـارەزوو ویسـت و خواسـتی دەروون ڕزگـارن، وە گەیشـتونەتە بـەرزترین وە پـێش تـرین پلـەی خـوا دۆسـتی، وە مادام کە دەسیان هەڵگرتووە لە هەرچی شتە جگە لـە خـوا نـەبیٚ، کـەوابو ئـیتر نـەخاوەن شـتن، نـە کەسیشـیان کردوەتـە خـاوەنی خۆیان "نەهیچیان هەیە و نەهی کەسیشن")[1].

پیـاوانی تەسـەووف ئـەو دەسـتە نمونەییـەن کـە دڵیـان پـاك و بێگەردە، بەجۆریٚ لە خـودی وشـەی پـاك و بێگـەردی گـەورەترە، چـونکە پـاك و بێگـەردی دڵیـان هـەموو مـەغزا و واتاکـانی لـە خۆگرتـووە، هیچـیان نیـە و هـی کـەس نـین، ئەمـە هاوکێشـەی ئەوانە و لەم پێناوەدا تیٚ دەکۆشن.

هەروا (شێخ (ذا النون المصري)) گەلیٚ پێناسەی تەسەووفی کردووە:

- لەوبارەوە (تەسەووف) دەڵیٚ: (ئەی خودای گەورە قەت گـوێم نەداوە بە دەنگی گیانلەبەرێك یان بەخشـەی گـەڵای دارێك، یـان بـە خورەی ئاوێك، یان نەوای پەلەوەرێك یان دەنگو ئاوازێکی خـۆش، یان هاژەی تاڤگەی ئاوێك گرمەی هەورێك، کە هۆیێك وە بەڵگـەیێك نەبوبن لەسەر پیشاندان و دەرخستن و دەربڕینی تاکو تەنیایی تـۆ وە لـەسەر ئەوەی کە تۆ خواییێکی بیٚ وێنەی وە وێنەت نیە)[2].

---

١ - تەسەووف چی یە ؟ ٨٢ و ٨٣.

٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٦ - ٧٧.

کوشتنی(نەفس) و پشت کردن لە ئارەزووەکان و کەم دەرگای تەسەووفن و هەروا گەورەترین سپاردە ڕێگەی تەسەووفن، چونکە سەرکێشی و لاڕێی (نەفس) بەرەو هەڵەدێرمان دەبەن و کە پاکێتی دوورمان دەخەنەوە، هەروەکو خودای گەورە لە زمانی (حەزرەتی)یوسفەوە(ﷺ) دەفەرمووێ:

﴿ إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ ﴾[1].

خودای گەورە ڕەزامەندی دەربڕیوە، تاکو جڵەوی نەفس بگرین، لەبەر ئەوە سۆفی تێ دەکۆشێت بەڕادەیەك جڵەوی هەستی ناپەسەندی خۆی ڕاگرێت، هەتا وای لێ دێت دەبێتە کردارێکی خودایی و خۆپەسەند.

– تەسەووف – خواناسی: (نیشانەی خواناس سێ شتە: یەکەم ڕوناکی خواناسیی ئەو نابێتە هۆی کوژاندنەوەی "نوری وەرعی"، "وەرع بریتی یە لە پارێزکردن لە هەموو حەرامێك، تەنانەت گومان لێ کراویش"، دووهەم هەرگیز بە زانیارییێکی دەرونیی باوەڕ ناکات کە پێچەوانە بێت لەگەڵ "قاهیری شەرع"، سێهەم زۆری نیعمەت و کەرەمی خوا لەگەڵیا، نابێتە هۆی شکاندنی پەرژینی خەڵك "واتە دەسەلأت وای لێ ناکات پێ لە بەرەی خۆی درێژ کات و دەس درێژ کات بۆسەری خەڵك")[2].

– ڕووداوێك لە بابەت خوداپەرستی: (ذا النون ئەڵێت: لە نزیکی شام دا ژنێکم دی "کە خۆی لە خواناسان بو" لێم پرسی

---

[1] – سوره یوسف، الآیه ٥٣.

[2] – تەسەووف چی یە ؟ ل٨٥.

ئەی خوشکە خوات لێ ڕازی بێت، لە کوێ وە دێیت؟ وتی: لەلای کەسانێکەوە ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا ﴾[1] دەڵێ لە پاشان پرسیم ئەی بۆ کوێ ئەڕۆیت؟ ولاتی بۆلای ﴿ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾[2]، دەڵێ گوتم توخوا باسیان بکە بۆم ژنەکە بە شەش هۆنراوەی جوان باسیان ئەکات بۆی کە ئەمە سەرەتای هۆنراوەکەیەتی، قوم همومهم بالله قد علقت... هتد، جا ئەوەش ناساندنێکی تری سۆفی یەکانە، بە زوانی قورئان، ئایەتی یەکەم خوا باسی خواناسێك ئەکات، کە زۆربەی کاتی خۆیان (بەتایبەت لە شەواندا، کە کاتی حەسانەوەیە) بە یادی خوا ئەبەنە سەر و، نانون، وە ئەفەرمێ تەنشتیان بێزارە لە پاڵ کەوتن و ڕاکشان لەسەر نوێن، ئەمە سەبارەت بە شەو و بەکاتی حەسانەوە و خەو، ئایەتی دوهەمیش هەر خوای گەورە باسی ئەو بەندانە ئەکات کە کارو کاسبی نابێتە هۆی ئەوەی کە خوا لە یاد بەرن، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشا کە کاسبی خۆیان ئەکەن، خواپەرستیش ئەکەن و یادی خوا ئەکەن و خوایان لەبیر ناچێتەوە)[3].

هەروەها (شێخ سهل التستری) پێناسەی تەسەووفی کردووە، کە تەسەووف لە پاکێتی و سەفاوە هاتووە، پڕ بووە لە فیکر و لەلایەن مرۆڤەوە بۆ خودا تەرخان کراوە، بۆیە باسی دەکا.

---

١ – سورة السجدة، الآية ١٦.

٢ – سورة النور، الآية ٣٧.

٣ – تەسەووف چی یە ؟ ل٨٥ – ٨٦.

- سۆفی: (کەسێکە دەروونی پاك بوبێتەوە لە لێڵی و ئالآیش وە پڕ بو بێ لە پەند و زانین وە بەستراپێت بە خواوە و لە خەڵك بچڕابێت، وە زێڕ و خاك بەلایەوە یەکسان بێت)[1].

لە جیهانی تەسەووف دا شتەکان بەچاوی بناغەیانەوە سەیر دەکرێت و تێگەیشتن لە هەموو شتێ تیایدا قووڵە (جیهانی تەسەووف جیهانێکە ئەگەر کەسێ بیەوێ بە تەواوی لێی تێ بگات، ئەبێ خۆی ببێتە گەشتکەر و گەڕۆکی ئەو جیهانە، وەکو هەموو جیهان و زانیارییێکی نەناسراوی تر... بەڵام هێشتا ناسینی جیهانی تەسەووف لە زانیاری یەکانی تریش نەناسراو و داپۆشراوترە، بۆچی؟ چونکە تەسەووف هەم تینە و هەم چەشتن، هەم... تابشی نوری هەقە بۆ سەری دەروون واتە ئیشراق، وە هەم مەقام و ئەحواڵە، مەقام هەروەکو پایەو پلەی ئیشی دنیایی وایە، وەکو بڵێین فیسار کەس مودیرە، یان مولاحیقە، واتە خەڵاتێکی دەوام دارتری خوداوەندی یە کە لە ڕێگەی خواپەرستی و زیکر و پارێزگاری (تەقوا)وە، بۆ سۆفیەکان دەست ئەدات، بەڵام حاڵ هەرچەن ئەویش هەر شتێکە لەم بابەتە، بەڵام بەردەوام نیە، واتە گۆڕان لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێ زوو زوو دەست ئەدات، وە بگرە چەن جاریش هەر ئەو حاڵە بڕوات و بگەڕێتەوە).

(شێخ) (أبو بكر الشبلي)(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) (دەربارەی تەسەووف فەرموویەتی):

---

[1] - قواعد الأخلاق في التصوف الإسلامي، ص٣٠.

- تەسەووف: وایە (دانیشتن لەگەڵ خودا دا بەبێ خەم) واتە بەبێ هیچ مەبەستێك.

- سۆفی: (پچڕانە لەگەڵ خەڵكدا و پێك گەیشتنە لەگەڵ هەق دا) وەك خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱصۡطَنَعۡتُكَ لِنَفۡسِي ﴾[1].

- تەسەووف: (درەوشانەوەی سووتاوە) بەواتا بروسكەیەكی دڵە لە بابەت مەحەببەتەوە بە هیچ جۆرێ گەڕانەوەی بۆ نیە.

- تەسەووف: (نەڕوانینە بە تەواوی لە گەردوون) ئەمەش واتای ڕووانینە بۆ دروستكاری گەردوون و خۆ خەریك كردن بە بنەمای گەردوون، نەك گەردوون خۆی، واتە ڕوانین لە دروستكار نەك دروستكراوەكان[2].

- سۆفی: (دەستی لە خەڵك بەرداوە، بە تەواوی لە خەڵك پچڕاوە، وە بەستراوە بە خوداوە، هەروەكو خوا فەرموویە، ئەمەش واتە پچڕ بوونە لە هەموو كەسێ، لە پاشان فەرموویەتی: ﴿لن تراني﴾.

شێخ (عبدالقادری گەیلانی) لەوبارەوە دەفەرمووێ:

- تەسەووف: (... ماڵی دنیا لە ڕێگەی حەلاڵەوە بێرە دەست، بەلاّم لەناوی دلا دای مەنێ، بەڵكو لەناوی دەستتا بێت، ئەمانە هەمووی بۆ ئەوەیە مرۆڤ تێ كۆشێت بۆ ئەوەی خوو خدەی دوڕندەیی وە جانەوەری لە مێشك و دەروندا

---

١ - سورة طه، الآية ٤١.

٢ - قواعد الأخلاق في التصوف الإسلامي، ص٣٠.

دەركات وە بيئا خنێت لە خدەی ئینسانی و مەلەکوتی تا ئەبێتە ئینسانێکی فریشتە خوو)[1].

واتا بالأ و هەڵکشان لە پێناو خوو خدەی بەرزە کە ئەویش دوورە و بگرە پێناسە ناپەسەندەکانی ڕیشە کێش کردووە و هەرگیز بوونیان نابێت.

– تەسەووف: (ڕاستگۆیی لەگەڵ هەق دا، چاکی خەڵك لەگەڵ خەڵکدا) (تەسەووف ڕاستییە لەگەڵ زاتی خودا و، شیرینی و جوانی ڕەوشتە لەگەڵ دروستکراوانیدا) دەکرێ بڵێین چاکییەکان ئەو دەکشێ هەموو بوارێك دەگرێتەوە.

– سۆفی: (ئەوەیە ڕێگا ببڕێ و بگاتە ئەوانەی کە ڕێگایان بڕیوە و گەیشتوونەتێ)[2].

– تەسەووف: (خودا (بەواتا الشارع) دانەری شەرع لە ڕێگای گەیشتن دا).

هەروەها شێخ (مەعروفی کەرخی) لەبارەی ناساندنی تەسەووف دواوە:

– تەسەووف: (لێیان پرسیوە تەسەووف چی یە؟ لەوەڵامدا گوتویەتی: پەیڕەوکردنە لە"حقایق" وە دوورە پەرێزی کردنە لەو شتەی کە بە دەستی خەڵکە).

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ل٨٤.

٢ – قواعد اخلاق في التصوف الإسلامي، ص٣٢.

– تەسـەووف: (لێیـان پرسـیوە: خۆشەویسـتی چـۆنە و چـی یـە؟ فەرموویە: ئەی برام خۆشەویستی شتێك نیە خەڵك بە دەرس بیڵێتـەوە، خۆشەویستی لەلایەن خۆشەویست خۆیەوە بەدەرس ئەوترێتەوە)[1].

خۆشەویسـتی ئـەو تاوەیـە، ئـەو گـەرمی یەیـە کـە ڕوو لـە هـەر لایێـك بنـێ، جگـە لـە خـودا هیچـی تـر نـابینی، بۆیـە (لای سـۆفی هەرچـی وا لـەم جیهانـەدا ئاوێتەییێکـە کـە خـوای گـەورە تیـا بـەدی ئـەکات، وە جگـە لـە شـوێنەوار و(ئایـات) و توانـایی و میهرەبـانی خوا نەبێت هیچی تێدا نابینێت)[2].

هەروا (سمنون) دەڵێ:

– تەسـەووف: بـە واتـا (خـاوەنی شـتێ نـەبی، و شـتێ خـاوەنـت نەبێت، بە واتا بەندە و خاوەنەکانی موڵکی گەورەبن)[3].

(شێخ) (ابو سعید الخراز) بۆ پێناسەی تەسەووف دەڵێ:

– تەسـەووف: (توانـا بـوون بەسـەر کـات دا) بـەوتا بـە فـیڕۆ نەچوونی هیچ شتێك لەکات بۆ پەرستش و تاعەتی خودا.

هەروەها (شێخ) (عمرو بن عثمان المکي) دەڵێ:

– تەسـەووف: بـە واتـا (بەنـدە لـە هـەموو کاتێـك دا ئـەوەی لـەلا ئەولاتر بێت لە هەموو کاتێك دا)[4].

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ٧٦.

٢ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٦.

٣ – الرسالة القسیریة، ص٢١٩.

٤ – الرسالة القشیریة، ص٢١٧.

- تەسەووف: (ئەوەتە بەندەی خودا لە هەموو کاتێکدا کردەوەیێك بکات لەو کاتەدا ئەو کردەوە و لە هەموو کردەوەیێك باشتر و پەسەندتربێت)[1].

ئینجا (محمد بن علي القصاب) چ بەخۆی یا ئەوانەی گێڕاویەتەوە، دەڵێ:

- تەسەووف: (ئەخلاقێکی بەرز و بەڕێزە، لە زەمانێکی بەڕێزەوە سەری هەڵداوە لەلایەن پیاوێکی بەڕێزەوە لەگەڵ خەڵکێکی بەڕێزدا)[2].

- ئینجا ئەمانە دەگێڕێتەوە:

لە مامۆستای (شێخ جونەید)یان پرسی: تەسەووف چی یە؟... لە وەلأما وتی: بریتی یە لە ڕەوشتێکی چاك لە مرۆڤێکی چاك لە کات و زەمانێکی چاکا بەرانبەر بە چاکان ئەکرێت.

لە (سەمنون) یان پرسی: تەسەووف چی یە؟ وتی: تەسەووف ئەوەتە (نەبیتە بەندەی کەس و کەسیش نەکەیتە بەندەی خۆت)[3].

هەروەها (شێخ رُوَیْم) ئەمانە باس دەکا:

- تەسەووف: (ناردنەوەی دەروون لەگەڵ خودا وەك ئەوەی دەیەوێ).

- تەسەووف: (لەسەر سێ خەسڵەت بنیادنراوە: بەدەست گرتنی فەقر و هەژاری، بەدەست هێنانی هەوڵ و نۆکەرانی خود و پشت کردن لە پێدا هەڵگرژان و هەڵبژاردن)[1].

---

١ - تەسەووف چی یە ؟ ل٨٠.

٢ - الرسالة القشیریة، ص٢١٧.

٣ - تەسەووف چی یە ؟ ل٨٤ ـ ٨٥.

(رُوَيْم) له(جُنَيْد)ی پرسیوه: ئایا خود(ذات)ی تەسەووف چی یە؟ لەوەلأمدا گوتویەتی: ئەوەیە لە بەندە دەبێ لەم قسانە بەدووربێ و لە خودی خۆی نەپرسێ، پاشان (رویم) زۆر پێ داگیری کردووە، گوتوویەتی: خەڵکانێك تەنها بۆ خودای گەورە بەجۆرێ تەنها خودا دەیانناسێ.

(ابی محمد الجريري) دەڵێ:

– تەسەووف: (چاودێری بارەکان و پێویستی ئەدەبە)[2]. ئەم دیارە لەم ئاکارو رەفتاری سۆفی رەنگ دەداتەوە، بەردەوام چاودێری دروست دەبێ بەسەری دا و پێویستی ئاکار جێ بەجێ دەکا.

هەروەها (شێخ)(عبدالقاهر السهروردی) دەڵێ:

– سۆفی: (ئەوەیە کە بەردەوام لە پاکسازی دایە، بەردەوام کاتەکان لە خەوشەکان... پاکدەکاتەوە بۆ پاککردنەوەی دڵ لە خەوشەکانی نەفس).

(شێخ)(عطاء الله اسکندري) دەڵێ:

– تەسەووف: (جا بەڵکو رونـاکی خودایی رووی کردە دەرونت، بەلأم کاتێ دێ ئەوە دەروونە خاوێن نیە، سەر لە نوێ روی لێ وەرچەرخاند و گەرایەوە، کەواتە تۆ دەرونت پاك کەرەوە لەهەرچی شتە(واتە دڵی مرۆڤ جگە لە یادی خوا هیچی تری تیا نەبێت) جا ئەو کاتە خوا پری ئەکات لە (ئەسرار و لە ئەنوار) واتە لە نهێنیەکان و لە رووناکی یەکان)[3].

---

١ – الرسالة القشيرية، ص٢١٧.

٢ – قواعد الأخلاق في التصوف الإسلامي، ص٣١.

٣ – تەسەووف چی یە ؟ ل٧٤.

لەبەر ئەوە ناسینی تەسەووف، ناسینێکی ناوەکی یە و لە دووناسین سەرچاوە وەردەگرێ و تێدەکۆشێ، کە پەیوەندیان بە یەکەوە توند و تۆڵ و قووڵە، ناسینی خۆی، هەروا ناسینی خودای گەورە، چونکە یەکێ خۆی نەناسێ چۆن دەتوانێ خوای گەورە بناسێ؟!! لە کاتێکا خۆی ناسی بەم جۆرە ڕێگەی خواناسی بۆ هەموار و ئاسان دەبێت، چونکە خۆناسی کارێکی سادە و ساکار نیە، پێویستی بە چەندە تێفکرین و ئەزموون و مەعریفە هەیە و لە هەموو دەوروبەری بڕوانێ و ڕوانگەی قووڵ لەم گەردوونەدا لە ناخی دروست بکا، بۆ ئەوەی شتەکان لە سەرچاوەی خۆیانەوە بڕوانێ ، نەك لەسەرچاوەی ترەوە بەشێوەیەك فێڵی لێ نەکرێ و فریو نەدرێ، لەمەوە قووڵ بوونەوە ڕۆڵی خۆی دەبێ.

(شێخ)(ابو سليمان الداراني) بۆ پێناسەی تەسەووف دەڵێ:

– سۆفی: (دڵی سۆفی مەنزڵی خوای گەورەیە، ئەو شتەش کە خوای دی نامرێت، کەواتە دڵی سۆفی هەرگیز نامرێت). لەبەر ئەوە هەر هەنگاوێك کە ڕێبواری تەسەووف هەڵی گرتووە نەمرە، چونکە هەر هەنگاوێکیان ناوە، بۆ خوایان هەڵگرتووە، لەبەر ئەوە سۆفییەکان لەسەر ئەو باوەڕەن، کە خۆشەویست و هەڵبژاردە و (وەلی) خودان، هەروا پارێزەری قسەی خودان.

– تەسەووف: (بەوە ئەڵێن سۆفی شتی وای بەسەرا دێت جگە خوا نەبێت کەس سەری لێ دەرناکات، هەروەها لەگەڵ خوای خۆیا وا لە حاڵێکا جگە لە خوا نەبێت کەس نای زانێت)[1].

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ل٨٢.

(دەگێرنەوە موریدێکی (شێخ محیی الدین العربی"١١٦٥ – ١٢٤٠ز"[1] ) هاتە لای شێخ، وتی: خەڵك ئازارم ئەدەن وە باوەر بەم رێرەوەمان ناکەن، شێخ فەرمووی: ئەگەر کەسێك داوای بەڵگەی کرد بۆ ناسینی ئەم رێگایە، تۆش لێی بپرسە، بەچی یا ئەزانیت کە هەنگوین شیرینە، بێ گومان ئەڵێ چەشتومە، بڵێ کەواتە ئەمیش تانەی چەشێ نای زانیێ)[1].

لەمەوە بۆ ناسینی تەسەووف لەبەرامبەر خەڵکدا سەختە، لەبەر ئەوە چەشتن تەواوی ئەم جیهانە دەکاتەوە و دەیناسێ، کەواتە خودی(چەشتن) قۆناغێکی مەزنە بۆ ئەوەی جێ بەجێ کردنی تەسەووف لە خەڵکی بگەیەنین، چونکە چۆن دەزانین میوەکان (زۆربەی)شیرینن، بێگومان بەهۆی چەشتنەوە یا تامی شەکر و هەنگوین و خورماش کە شیرینن، بەڵام هەریەکەیان تاموزاری خۆیان هەیە، تەنها بە چەشتن دەردەکەون، جا بەم هۆیەوە هاوکێشەکە تەواو دەبێ بەهۆی زانین، پاشان دیتن، ئینجا چەشتن.

(إبن عطاء) بۆ ناساندنی تەسەووف دەڵێ:

– تەسەووف: (ناردنەوەیە لەگەڵ هەق دا)[2].

بێگومان لێرەدا خاوەن هەق و هەق تێکەڵ بەیەك بوون و لێك جودا ناکرێنەوە.

(شێخ) (أبو تراب الخشبی) دەڵێ:

– سۆفی: (کەسێکە هیچ شتێ لێڵی ناکات، وە هەموو لێڵێك بەو ڕوو دەبێتەوە)[1].

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٨٠.

٢ – التعرف لمذهب اهل التصوف، ص١٠٩.

- سۆفی: (بەوەوە هەموو شتێ پاکژ دەبێتەوە).

(شێخ) (بشر الحافي) دەڵێ:

- سۆفی: (بەکەسێ ئەڵێن کە دڵ و دەروونی پاك بوبێتەوە)[2].

پاکژبوونـــەوە شـێوەی ڕەهـا دەگەیـــەنێ و پاکــژ بوونەوەیـــەك هەموو پاکژبوونەوەکانی تر بەرپەچ دەداتەوە.

هەروەها (شێخ)(أبو يعقوب السوسي) دەڵێت:

- سۆفی: (کەسێکە هەرچی یەك هەیە بیبەن بێزار نابێت، هیچ داواکاریەك ماندووی ناکات)[3].

- سۆفی: (لە ڕێگەی گەیشتن بە خودا دا قەت کۆڵ نادات).

(شێخ) (بایەزیدی بەسطامي) بۆ ناساندنی تەسەووف دەڵێ:

- ســـۆفییەکان: (وەك منـــداڵێك وەهـــان کـــە خـــوا خـــۆی پەروەردەکردنیانی گرتووەتە خۆی"وان لە پەنای خوادا")[4].

هەروەها (شێخ) (حسين الحلاج) دەڵێ:

- سۆفی: (تـاك ڕەوە، نـە کـەس ئـەتوانێ بیگرێتـە خۆی، وە نـە ئەویش کەسی گرتووەتە خۆی)[5].

ڕێگاکەی تاك و تەنها و یەك ڕێگایە، جا بە چەند شێوەیێ بەڵام لـە ئاسـتی خەڵکدا بێگومـان تـاك ڕەوە و کـەس نایگرێتـە خـۆی و ئەویش کەسی نەگرتۆتە خۆی.

---

١ - الرسالة القشيرية، ص٢١٩.

٢ - تەسەووف چی یە ؟ ل٨٢.

٣ - التعرف لمذهب اهل التصوف، ص١٠٩.

٤ - تەسەووف چی یە ؟ ل٨٢.

٥ - هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٨٣.

تیاچوونی سۆفی لەو ڕەوشەی کەس ناگرێتە خۆی فەنا بوونی لاشە لەناو لاشەدایە، یاخود لاشە لە ڕێگەی ویستی لاشەدا خۆی تیاببات، ئەوەنیە و هەروەها تێداچوونی ڕۆح بۆ ڕۆح، یان لەناو ڕۆحدا نیە، بەڵکو فەنا ئیرادەیە لەناو ئیرادەدا، فەنای ڕەوشتە لەناو ڕەوشتا، وە (صفات) لە(صفات)دا، کەواتە ویستی خۆت لەناو دەبەی بۆ ویستی خودا، ڕەوشت ئەبەیتە سەر ڕەوشتی ئەو، صیفاتت ئەکەیتە صیفاتی خودایی[1]، وە صیفاتی بەشەریی خۆت تور ئەدەیت[2].

هەروەها (شێخ)(أبو الحسن الحصري) دەڵێت:

- سۆفی: (کەسێکە دەستی هەڵگرت لە ئافاتی جیهان، ئیتر ناگەڕێتەوە بۆلایان وە کە ڕووی کردە لای خودا ئیتر ڕووی وەرناگێڕێت، وە هیچ ڕووداوێك ناتوانێ کاری تێکا و حاڵی بگۆڕێت).

- سۆفی: (بە کەسێك ئەڵێن: لەم جیهانەدا دڵی بە هیچ ئارام و ئۆقرە نەگرێت بەخوا نەبێت، وە کەسێکە کە کاری خۆی دابێتە دەستی خوا، خواییێك کە خۆی نەزانێت چی بۆ داناوە)[3].

---

١ – واتە: بە ڕەحم و سۆز دەبیت لەگەڵ هەموو بوونەوەر، وە ڕێز لە هەموو دروستکراوان دەنێیت، هەرچیت بێتە دەست دەیبەخشیەوە، دادپەروەر دەبیت، نەرمونیان دەبیت ... هتد.

٢ – تەسەووف چی یە ؟ ل٧٧.

٣ – واتە: سۆفی خۆی بە تەواوی تەسلیمی خودا دەکات، لەهەمان کاتدا کە نازانێت خودا چ شتێکی بۆ قەرارداوە چاك یان خراپ، خۆشی یان ناخۆشی، ساغی یان نەخۆشی، هەژاری یان دەوڵەمەندی، نیشتەنی یان دەرکراو لە زێدی خۆی.

**پاشان دەپرسێت: ئایا تۆ کە پەیڕەویت نەکرد لە هەق" ئەوە ناگەیێنێت کە پەیڕەوت کردووە لە گومڕاهی؟!**[1].

**- تەسەووف: (وەستانە لەگەڵ ئادابە شەرعیەکان بە(ڤاهیری))، ئینجا حوکمەکانی دەبینیٚ لە(ڤاهر)ەوە بۆ (باگن)، وە هەروەها لە (باگن)دا حوکمەکانی دەبینیٚ، لە(باگن)دا بۆ (ڤاهر) لەبەر ئەوە بۆ سۆفی هەردوو حوکمی تەواو بەدەست دیٚ)**[2].

**هەروا (شێخ)(ابو سعيد ابو الخير) دەڵیٚ:**

**- سۆفی: (بەکەسێك دەڵێن: هەرچی لەسەر دایە لای بات، وە هەرچی لە دەست دایە بیدات).**

**واتە: هەرچی لە ویستی خراپ"وە خراپە کردن لەسەریەتی دەری کات، دەست قوچاو نەبێت و، لە بەخشینی سامان و سەرمایە بە هەژاران درێغ نەکات**[3].

**لەبەر ئەوە ئەم ئاکارانە پاکی و بێگەردی دەنوێنی، دەبیٚ دڵ پاك و بەخشندە بێت، چونکە بەخشندەیی پایەیەکی گرنگە لەلای هەموو ڕێڕەوانی ڕێگەی تەسەووف و مەبەستی سەرەکی تێدا کۆکراوەتەوە، چونکە نابێت مرۆڤ کۆیلەی سامان بێت، بەڵکو دەبیٚ ماڵ و سامان و هەرچی دروستکراوێکە کۆیلەی ئەوبن.**

---

**١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٨٤.**

**٢ - قواعد الأخلاق في التصوف الإسلامي، ص٣٢.**

**٣ - تەسەووف چی یە ؟ ل٨٤.**

(شێخ)(ابو النصر السراج) یەکێکە لە گەورە پیاوانی تەسەووف، کە چەندەها پێناسەی کۆکردۆتەوە و لە کتێبە بەناوبانگەکەی (اللمع)دا باسی کردووە" دەڵێت:

- سۆفییەکان: (ئەوانەن کە خوا ئەناسن و، لە دەستوور و فەرمانەکانی شارەزان، وەك ڕەفتار ئەکەن بەو دەستوورانەی کە خوا شارەزای کردوون لێی، هەر شوێنی ئەو شتانە ئەکەون کە خوا شارەزای کردوون لێیان، ئەو شتانە ئەنجام ئەدەن کە خوا بۆی داناون، ئەوەشیانی دەست کەوتووە، کە بۆی گەڕان و وێڵی بوون، وە دەستیان هەڵگرتووە لە هەرچی شتێکی تر کە بەدەست دێت)[1].

(شێخ)(یوسف بن الحسین) دەڵێت:

- سۆفییەکان: (لەناو هەموو (ئوممەتێك)دا بڕێکیان هەڵبژاردەی ئەو ئوممەتەن، ئەوانە خوا هەڵیان ئەبژێرێت بۆخۆی وە لە خەڵکیان ئەشارێتەوە، وە ئەگەر لەناو ئوممەتی (محمد)دا(ﷺ) ئەو هەڵبژێردراوانە هەبن" بێگومان صۆفی یەکانن)[2].

دیسان (شێخ)(ابو سعید الخراز) دەڵێ:

- سۆفی: (کەسێکە خوداوەند دەرونی خاوێن کردۆتەوە" وە پڕی کردووە لە نور، وە کەسێکە بە یادکردن و ناوبردنی خوا ئەگاتە ئەوپەڕی خۆشی کامەرانی).

هەروەها (شێخ)(جعفر الخلدي) دەڵێت:

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٨٥.

٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٨٦.

- تەسەووف: (بەوە دەڵێن نەفس بخەیتە ژێرباری بەندەگی، وە دەرچی لە هەموو ویستێكی بەشەری، وە بە هەموو هەستێكەوە روو بكەیتە خواناسی)[1].

دیسان (الشبلي) دەڵێ:

- تەسەووف: (سەرەتای خواناسینە و ئاكامەكەشی خوا بە تاك زانینە"یەكتاپەرستی").

ئینجا (شێخ)(زكريا الأنصاري) دەڵێت:

- تەسەووف: (زانستێكە باری پاككردنەوەی نەفسەكانی دەزانێ و پێناس دەكا، هەروا پاكسازی دەكا لە ئەخلاق، (ظاهر و باطن) چاك دەكاتەوە بۆ بەدەست هێنانی بەختەوەری ئەبەدی)[2].

- تەسەووف: (تەرككردنی هەڵبژاردنە و گواستنەوەی بێجگە لەوانە).

- تەسەووف: (پاراستنی هەستەكان و چاودێری هەناسەكانە).

- تەسەووف: (جدییەت لە سلوك بۆ پادشای پادشان)ە[3].

هەروەها (شێخ)(ابوبكر الكتاني) دەڵێ:

- تەسەووف: (ئەخلاقە، ئەو كەسەی رەوشتی لە تۆ بەرزتربێت رووناكی و پاڵێوراویشی لە تۆ زیاترە).

- تەسەووف: ( (پاكی دیتنە) لەم دوو وشە كورتەدا هەم (هۆ) باس كراوە، هەم (ئاكام)، مەبەست و (غایەیە) كە (موشاهەدە)یە واتە دیتن، یان (عين اليقين) چاوپێ كەوتنی نهێنییەكانە (ماوراء الطبيعة) كە لەم رێگایەوە نەبێ دەس نادات، وە هۆیەكەش بۆ

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٨٦.

٢ - حقائق عن التصوف، ص٩.

٣ - قواعد الأخلاق في التصوف الإسلامي، ص٣٢.

گەیشتن بەم ئاکامە پاکی دەروونە، واتە(صفاء) ڕێگەی تەصەووفیش ڕێگەی خاوێن کردنەوەی دەروونە، کەواتە: (التصوف صفاء ومشاهدة) خاوێنیە و دیتن)[1].

هەروەها (شاهی نەقشبەند) دەڵێ:

- ئەم ڕێرەوەی ئێمە سەراپای ئەدەبە.

لە کتێبی (تذکرة الأولیاء)ی فەریدەدین عطاردا لەسەر زمانی(شێخ)(أبو الحسين النوري)یەوە دەڵێت:

- تەسەووف: (نە ڕەسمە (واتە دابونەریت) وە نە زانیاری یە، بەڵکو (ئەخلاقی خوداوەندیە)؟ چونکە ئەگەر ڕەسم بوایە بەبێ تێ کۆشان ئەهاتە دەست، وە ئەگەر زانیاریش بوایە بە خوێندن فێری ئەبووین بەڵام ڕازاندنەوەیە بە ڕەفتاری خوداوەندی، وە کەسیش ناتوانێ لە ڕێگەی خوێندن و تێکۆشانەوە ببێتە خاوەنی ئەو ڕەفتارە، مەگەر بە پەیرەوکردن لە ڕەفتارەکە)[2].

هەروا (الشيخ أحمد زروق) دەڵێ:

- تەسەووف: (زانستێکە بە مەبەستی چاکسازی دڵەکان، (بە) تاك و تەنهایی بۆ خودای گەورە)[3].

هەروا (شێخ محمد امين الكردي اربلی) دەڵێ:

- تەسەووف: (شەریعەت درەختە، تەریقەت لق و پۆپەیەتی، وە حەقیقەت بەرهەمەکەیەتی، وە حەقیقەتیش خواناسی یە لە ڕێگەی دەروونەوە، بریتی یە لە "تەصەووف").

---

١ - تەسەووف چی یە ؟ ل٨٧ - ٨٨.

٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٨٧.

٣ - حقائق عن التصوف، ص٩.

# نـــەيـــارانـــی تـــەســـەووف

ئـەوەی لێـرەدا گرنگــە هەنـدێ بابــەت دەكەونــە سـنووری ئــەم سـەردێڕە دەبـێ جودایـان بكەینـەوە، ئـەویش لـەم پرسـیارانە خـۆی دەدۆزێتــەوە كـە: ئایـا نـەیارانی تەسـەووف لەكەیـەوە دەسـتی پێكـردووە؟!!، ئایـا لەگـەڵ سـەرهەڵدانی یـاخود لــە كـاتێ كـە ڕۆژهەلأتناسـان پشـكنینیان لەبارەیـەوە كـرد؟!!، یـا ئـەوەتا خـودی دەسەلأت لەسەردەمە جیاوازەكاندا ڕۆڵی هەبووە؟!!، لە ڕاستیدا زۆر پێویستمان بە ڕوونكردنەوەی تەواوە، چونكە دەست نیشانكردنیان ئەو سەردەمە دەردەخا كە لێكترازانی تیایدا هەبوو، بە هەر حاڵ زیـاتر سـەردەمی زووی تەسـەووف هێنـدە گرفـت نیـە، چـونكە هاوگییـانی و هـەمانگی قـووڵ لـە ئارادا بـووە و خـودی كۆمـەڵگای ئیسلام تیایدا ئارام بووە لە بارەی پەرەسەندنی ڕوحی تیایدا.

جـا لـەم ڕووەوە هـەر ڕووداوێـك هاتبێتـە پێشـەوە كـاری لـە نـاواخنی تەسـەووف و پەرەسـەندن و چالاكی نـەكردووە، لەبـەر ئـەوە بـەر لـە هەرشـتێ باسـكردنی (نـەیارانی تەسـەووف) زیـاتر مەسـتمان لـە حـاڵی حـازرە كـە تیایـدا هەنـدێ مەسـەلەی نـامۆ لـە ناوەڕۆك و نامۆ لە چالاكییەكانی دێتە ئاراوە.

ئەوانەی هێرشیان کردۆتە سەر تەسەووفی ئیسلامی لە هەمان کاتیش تانە و تەشەریان لێ داوە و بە هەموو جۆرێ درۆیان بۆ سازکردووە و بەشێوەیەك مامەڵەیان لەگەڵ کردووە کە لە ناوەڕۆکی بدزن و بە هەندێ تێزی بەر لە خۆی کاریگەر بکەن، ئەمەش لە ناوەڕۆکی خۆی دووری دەخاتەوە کە گومان لەوە نیە لە نێو کۆمەڵگای ئیسلام و بەهۆی ئاینی ئیسلامەوە هەڵقولاوە و ڕێچکەی گرتووە، جا ڕوانین لە هەوڵ و کۆشش و تێکۆشانی ڕێبەرانی تەسەووف ئەمە دەسەلمێنن، کە چەندان تێزی نوێیان لە ئیمان و بیرو چەمکەکان هێنایە کایەوە.

بۆ ئەم مەبەستە ئەوەی زیاتر زەق بۆتەوە و هاتۆتە ئارا لە ڕووی مێژووییەوە ئەو خاڵە وەردەگرین تیایدا ڕۆژهەڵاتناسان لە مەغزای تەسەووفی ئیسلامی کۆمەڵێ بیروڕایان ڕاڤەکرد، بەڵام وەنەبێ ئەمە هەر لەسەر وان وەستابێ، بەڵکو شێواز و جۆری تری لێ کەوتۆتەوە، لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین ئاماژە بۆ چەند جۆرێکیان بکەین، لەوانە:

<u>یەکەمیان:</u> ئەوانەن خۆیان بیروباوەڕیان یان ئیمانیان بە ئاینی ئیسلام نیە، لەگەڵ هەموو کردارێکیان بە پلەی یەکەم خەریکی دیراسە کردنن لەبارەی شارستانی ئیسلامی، دیارە ئەمەیان چەند ڕەهەندێکی لەخۆ گرتووە، ئەویش ئەوەیە دەیانەوێ لەلایەکی کاریگەرییەکان سووکتر بکەن بەسەر دەرەوەی تەسەووفدا، هەروەها دەیانەوێ ڕەگەکان بن کوڵ بکەن و بۆ شوێنانی تر بیگوازنەوە، لە کاتێکا شارەزایی لە دەوروبەری و نزیك خستنەوە لێ یان دەبێتە ئامانجیان.

لەلایەکی تریشەوە دەیانەوێ لە کەلتوری بمژن و بۆ خۆیان سوودی تەواوی لێ وەربگرن و لە ڕەهەندێکدا لەگەڵ ئەوەی لێی دەمژن، ئەو کاریگەرییەش بسڕنەوە، کە بۆیان هاتووە، بێگومان ئەوانەی بەم جۆرە دەناسرێنەوە زیاتر دەتوانین بڵێین خودی ڕۆژهەڵاتناسەکان دوای دیراسەکردن و شوێنەوار و کاریگەرییان دەگرێتەوە.

ڕۆژهەڵاتناسان لە ناوەوە و بەرپەرچدانەوەی شارستانی ڕۆژئاوادا هاتۆتە کایەوە و سەری هەڵداوە، ئەمانە بە قووڵی ویستوویانە هەموو شێوازەکان بەکاربهێنن بۆ ئەوەی تەواوی کەلتورەکان بەگشتی و تەسەووف بە تایبەتی لەبار(لەناو) ببەن، لەوێنە و شێوەی خۆیان دووریان بخەنەوە، ئەمەش ئەو پەڕی فریودان و گاڵتەبازی پێوە دیارە و دەیانەوێ بە جۆرێکی تر لە دژی ئاینی پیرۆزی ئیسلام کار بکەن، ئەمانە دوژمنی ئاینی ئیسلام و پەیامەکەین، دەکرێ بڵێین درێژە پێدەری پەیامی کۆن و لەمێژینەیانن بە ڕووکارێکر دەچنە ناو کۆمەڵگای ئیسلام و لەبەینی دەبەن، و ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەگەڵ کۆمەڵگاکەی لێك جودا دەکەنەوە و، تانەو تەشەری لێ دەدەن و دەیانەوێ دوو بەرەکی هەموو شوێنێ بتەنێتەوە و لە هەموو جێگایەکدا ئەم تۆیە، تۆی دووبەرەکی بچێنن و لە ڕیزەکانیدا قین و دوو دڵی بڵاوبکەنەوە، لەم ڕووەوە گەلێ نووسەرو لێکۆڵەر لایان پێدا کردۆتەوە و ویستوویانە ئەم پەردەیە لابدەن، کە خۆیان پێ داپۆشیوە و لە ژێریەوە مەبەستی خۆیان دەپێکن، چونکە ئەمانە زۆر خۆیان ماندوو کردووە لە هەموو ساتەکاندا دیراسە و لێکۆڵینەوەیان لە بابەت پەیام و کۆمەڵگای

ئیسلام کردووه تاکو له نهێنییه‌کانی شاره‌زا بن و بتوانن درز دروست بکـه‌ن و لێـوه‌ی بچـنه ژووره‌وه و تـاکو ئـه‌و ده‌روازه و ده‌رگایانـه هه‌ڵبژێرن که کار له مرۆڤی ئه‌م کۆمه‌ڵگایه ده‌کات.

ئه‌مانه‌ش له‌و باره‌وه واته ڕۆژهه‌ڵاتناسان بیروڕا و بۆچوونیان بلاوکردۆتـه‌وه کـه هاوکـات بـوو له‌گـه‌ڵ ئیسـتعمار و داگیرکردنـی ولاتـه (ناوچـه) ئیسـلامییه‌کان و دزینـی کـه‌لتووریان، له‌گـه‌ڵ ڕۆژهه‌ڵاتناسـان هـه‌موو ڕێ و شـوێنیان لـه‌م پێنـاوه گرتۆتـه بـه‌ر، که‌چـی هه‌نـدێکیان لـه کتێبـه‌کانیان دا مـه‌دح و ستایشـی ئیسـلامیان کـردووه، ئه‌مه‌شـیان وه نـه‌بێ له‌بـه‌ر خـودی مـه‌دح و ستایشـه‌که‌دابێ، بـه‌ڵکو ویسـتویانه پێیـان لـه‌لای تاکـه که‌سـی موسـڵمان بسـه‌پێنن و سـیقه‌یان لـه‌لای خوێنـه‌ر به‌ده‌سـت کـه‌وێ، تاکو وه‌کو پردێ زۆربه‌ی بیرو ڕاکانی تریـان قبـوول بـێ و بتـوانن ئامانجـه‌کانیان بپـێکن، چـونکه هـه‌ر ئه‌مانـه له‌لایـه‌ك کـه مـه‌دح و ستایشـیان کـردووه هـه‌روه‌ها گـه‌لێ بوختانیـان بـه ئـاینی ئیسـلام لکانـدووه، جـا بێگومـان لـه پشـت ئـه‌م بوختانانـه‌وه فریـودان و قـه‌ڵپی ده‌رده‌کـه‌وێ، یـاخود هه‌نـدێ جـار بـیروڕا و باسـه‌کان لـه ڕێگه‌ی لێکۆڵه‌ری زانستی ده‌خه‌نه ڕوو، بێگومان لێکۆڵه‌رێکی بێ لایـه‌ن لـه نێـوان کـه‌لتووره‌کان بـۆ ئـه‌وه‌ی ڕێگه‌یـه‌کی دیکـه بـه‌کار بێنـێ لـه پێنـاو قه‌ناعـه‌ت پێکـردن و درز خسـتنه نـاوه‌وه، بـه‌ر لـه هـه‌ر شـتێ زانسـته‌کانی ئیسـلام لـه‌ناخی خۆیـان و کاریگـه‌ری کۆمه‌ڵگا و په‌یامی ئاینی پیرۆزی ئیسلام جودا ده‌که‌نه‌وه.

گەر بپرسین چۆن لەم کەلتورە فرەوانەیان کۆڵیوەتەوە؟!! هەر دوور نەڕۆین دوای ئەوەی لە کەلتووری تەسەووفیان ڕوانیوە و ئەو مێژووە سەرسامییەیان لەبارەوە ناسیوە و بیستووە، هەر زوو نووسیویانە کە تەسەووف لە یەهوودییەت یاخود لە نەسرانی یاخود لە بوزییەوە سەرچاوەی گرتووە و هاتوون، هەتا لەبارەی وشەکەوە بەیۆنانیە کۆنەکانەوە لکاندوویانە، گەر لەوە زیاتر بچین و قووڵبینەوە ئەو سەرنجە لامان گەلاڵە دەبێت کە ڕێبەرانی تەسەووفیان بە گەلێ گوتە و کرداری لە ڕێ لادەر تاوانبار کردووە، ویستوویانە درز بخەنە نێوان شەریعەت و حەقیقەت و هەتا لە نێو زاراوەکان و دوا ئامانجەکان دا بە قووڵی کاریان کردووە، تاکو لە ناوەڕۆکی تەسەووف لەلایەك و لە ناوەڕۆکی شەریعەت لەلایەکی تر بێ بەری بکەن، چونکە گەلێ لە زاراوە و حاڵ و مەقامەکان کەوتونەتە ئەم گرفتەوە و تەفسیر و بیروبۆچوونی لە ڕێ لادەریان گوزارشت لێکردووە، لەوانە بۆ (الحلول) و (الإتحاد) و (وحدة الوجود) و (وحدة الأديان) و چەندەهای تر.

سەرباری ئەمانە لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان دا بەردەوام ئەو لایەنەیان دەرخستووە و درزەکەیان گەورە کردووە، کە تەسەووف لە هەندێ مەسەلەدا چلۆن لە نێوان ژیان و گوزەران لەلایەك و پەرستش لەلایەکی تر ناکۆکی هەبووە و هاتوون تەنها ئەمانەیان خستۆتە ڕوو، باسیان لەلایەنە ئیجابیەکان نەکردووە، چ جای ئەوەی ساکاری و سادەیی خەڵکەکەیان قۆستۆتەوە و قۆرغیان کردوون، ویستویانە لە ناخی تاکەکان دا کاربکەن لە هەموو ڕوویەکەوە چ سیاسی چ کۆمەڵایەتی چ ئابووری چ ڕۆشنبیری

خۆیـان بسـەپێنن لەبـەرگی ڕاسـتی دا کـە زوو پـەردەی ئەمانـە دەرکەوت و ڕوویان بینرا کە تەنها فریودان و دوور لە ڕاستی یە.

جـا ئـەم شـێوازانە لـەلای ڕۆژهەڵاتناسـان بـەکاردێن بـە گـەڵ زانسـت و مەعریفـەی تـر ئـاودراوە، لەبـەر ئـەوە ئەمانـە فریـودەرن، ئەمانە دوژمنن بە جۆرێکی تر ململانێ دەکەن، بێگومـان ئەمانـەش لە ئامانج و ئەنجامەکان بەدەردەکەوێ، چونکە ئەگەر ڕاست دەکەن دەبوا بەوپێیەی مـەدح و ستایشـی ئـاینی پیرۆزی ئیسلام دەکـەن" ئەوا خۆیـان لـە ئیمـان پێهێنانـدا بدۆزیبوایـەوە، کەچـی لـە شـوێنی تـردا بـەجۆرێکی تونـد تانـەو تەشـەر لـە ئیسـلام دەدەن و هێرشـی نـاڕەوای دەکەنـە سـەر کـە بـۆنی ناپـاکی لێ دێ، بۆیـە ئـەمان هەندێکیان کە زۆر ستایشیان کردووە گەر ڕاستگۆ بوونایـە دەبـوا بەرگری لێ بکەن و، خۆیان تەسلیمی حەقیقەت بکەن، کە لە هـەموو شتێکی گەردوون گەورەترە.

<u>دووەمیان</u>: جۆری دووەمیـان، ئەمانـە دەتـوانین بۆچـەند بەشێك دابەش بکەین، بەڵام هەموویان دەچنە ئەم خانەیـەی کە دوورن لـە حەقیقـەتی تەسـەووفی ئیسـلامی و لـە قـووڵیی لـە تەسـەووفەوە سەرچـاوەیان نـەگرتووە و باوەڕیـان بـە لێکۆڵینـەوە و قسـەی دەرەوەی تەسـەووفە و ڕەنگـە بـە پلـەی یەکـەم وەك زانسـتێکی سەربەخۆ سەیری نەکەن، بەڵکو بەلای پەیوەندییە کۆمەڵایەتیـەکان دا دەچن و هـیچ مەسـەلەیەکی تـر ناکەنـە ڕوانگـە، لەمـەوە هـەر لـە بابـەت خـودی زاراوە و جـۆری پەرسـتش و حـاڵ و مەقامـەکان دا بـیروڕای دەرەوەی تەسـەووف لایـان گـرنگترە و گوتـەی ئـەولیا و پیاوان و مێژوونوسـانی تەسـەووفی ئیسـلامی بـە پلـەی دوو دێـت،

ئـەویش لــە پێنــاو بۆچــوون و بـیروڕای دەرەوەی ئـەم زانســتە، بەتایبەتی ڕۆژهەڵاتناسان لایان شوێنی شیاوی هەیە، وە نەبیٚ لـە گوتـە و کتێبـی تەسـەووف سەرچاوە کۆنـەکان نـەڕوانن، بـەڵکو بـە ڕوانگەیەکی ڕووکەشانە و سەرپێیانە تەماشای دەکەن، ئەمانـەش ئەم بەشانەی لیٚ دەکەوێتەوە:

١) ئەمانە خۆیان لە حەقیقەتی تەسەووف گێل کردووە، بەلاٚم هەندیٚ شتیان وەرگرتووە لـە تەسـەووف کـە تـەنیا خـۆی لـە فیکـرە دەنـوێنیٚ، کـە ئـەم فیکرانـەش هـی هەنـدیٚ کەسـن بـە ڕاسـتەقینە لەسەر زانستی تەسەووف حیساب ناکرێن، بەڵکو لـە ڕیٚ لادەرن و تــەنها داواکــارن بــۆ تەســەووف و بۆخۆیــان لــە تــەك حەقیقــەتی تەسەووف دا، حەقیقەتێکی تریان ساز کردووە، تاکو لە بنـەڕەت و گرنگی کەم بکاتەوە، بۆیە لەم حاڵەتەدا وەرگرتنـی بـاری ڕووکـەش و لادانــی بــاری قــووڵی و پێگــە و بنەڕەتیــەکانی ئــەم جــۆرەن، کــە لەگەڵ ئـەوەی بـە گشـتی فیکرەکـەیان قبووڵـە، ئـەوا کـردار و کـاری هەنــدیٚ لــە ڕیٚ لادەریــان وەرگرتــووە و بــۆ خۆیــان لەبەرامبــەر تەسەووفی ڕاستەقینە گرنگی پیٚ دەدەن.

لـە ڕاسـتیدا لـە تـەك ئـەم تایەفەیـە، بابـەتێك لـە خـودی زانسـتی تەســەووف هاتۆتــە ئــاراوە و لەسەرچــاوە کۆنــەکانیش ئامــاژەی پێدراوە کە چۆن ڕاستییەك، چۆن ڕاستگۆییەك پێویستە؟! لەبەر ئەوە جیاوازی کراوە بۆ ئەو کەسانەی دێنە دونیای تەسـەووف بـۆ قۆرغ کردنی ئەم دونیایە، یان لە پێناو ئامانجێك دوور لە ئامـانجی تایبەتی خۆی، کە ئەمانەش بێگومان بەرپەچ دراوەتەوە بـۆ ئـەوەی ڕیٚ لە ڕیٚ لادەران بیگریٚ و ئەم زانستە بە پاکی و پاکیزەیی خـۆی

بپارێزێ لە پێناو پەرستشێك كە هەموو بنەماكان ڕوونكراوەتەوە، ڕێگـای وەك مەشـخەڵ دیـارە و لـە قورئـانی پـیرۆز سەرچـاوەی گرتـووە و تـەنها لـە دایكبـوونی پـەیامی پـیرۆزی ئیسـلامە، ئـەو بابەتـەی لـە خـودی تەسـەووف جـودا كراوەتـەوە لەگـەڵ حەقیقـەتی تەسـەووف بـە سـاختە و ڕیاكـاری و بـە پەسـەندی دەناسرێت، كـە ئەمانە بە هیچ شێوەیەك پەیوەندییان بە ئایینی ئیسلامەوە نیە و كارەكانیـان تـەنها بـۆ فریـودان و هەڵخەڵەتاندنـە و گرنگـی بـەو بوارانــە دەدەن، لــە شــەرعەوە دوورن، تەســەووف بــە مــوو لــە شـەریعەت دوو ناكەوێتـەوە، بـەڵكو بـەبێ چوارچێوەی شـەریعەت هیچ مانایەك ناگەیەنێ و ئەمانـە دەچنە ئەو چوارچێوەیەی كە لـە شــەریعەت دوور دەكەنــەوە و خــەڵكی فریــو دەدەن لەلایــەك و لەلایـەكی تـر لـە گرنگـی ڕاستەقینەیی تەسـەووف كـەم دەكەنـەوە ئەمانـە تایەفەیـەكن جـودا جـودا دێنـە دونیـای تەسـەووف و دزە دەكــەن و لــە هــەمان كاتــدا خۆیــان وەك پیــاوان و موریــدانی تەسـەووف نیشـان دەدەن و ئیـدیعای ئـەوە دەكـەن، لەبـەر ئـەوە ئەمانە لە ڕێ لادەر و ئیدیعاكەرن بۆ تەسەووف، لەبەر ئەوە خێرو شەڕ لە هەموو شوێن دا هەیە و لای هەموو تایەفەیەك هەیە، لەبەر ئـەوە هــەموو سـۆفییەك خــراپ نیــە و بەهــەمان شـێوە هــەموو سـۆفییەك بـاش نیـە، بۆیـە هـەموو زانـا و عـالیم و قـازی و... هتـد نـاتوانرێ بـە پەسـەند نـاو ببرێ، بـەڵكو دەبـێ چوارچێوەی مـەزنی شـەرعییەت بكرێتـە پێـوەر و لەمـەوە لـە دونیـا و قیامـەت و دوایـی بڕوانین، چونكە ساختەكارەكان تەنها ئیدیعا دەكەن و لەناوەڕۆكدا گـەر لێیـان وورد بینـەوە بـەم جۆرە نین، بـەڵام ڕاسـتگۆیان گـەر بـە

بەرچاوی خەڵکەوەش نەبێ، بەردەوام یادی خوا دەکەن، ئەمەش یەکەم و ئاخیر پەرستشە لەلایان، بگرە مەسەلەی خەڵك لەلایان دەبێتە شتێکی زۆر بێ نرخ و بەها.

ب) ئەمانە بەو مەسەلە ناوازانەی خراونەتە تەسەووف و لە کتێبەکاندا هەن فریویان خواردووە، لە کاتێکدا بڕوا ناهێنین بە لێکۆڵینەوەی وورد، بەڵکو کوێرانە باوەڕ بە هەموو شتێ دەکەن، کەواتە ئەوانەی لە تەسەووف دا هەن هەرچەندە گەلێ زۆرن و تا ئێستا سەرچاوەکان نە دۆزراونەتەوە لەبەر ئەوە لابەلاش و لە زۆر شوێنان کتێب هەن و ڕووداوەکان چەندان گێڕانەوە لە خۆ دەگرن، بۆیە ئەوانەی ئاستی بڕار کردنیان نیە و بڕوا دەهێنین بەو بابەتانەی سنوور دەبەزێنن، ئەمە بۆ خۆی کاڵفامی و دوور دەستی تێدایە، بەبێ ئەوەی بنەمایەکیان هەبێ بۆ ئەوەی حەقیقەتەکان بچەسپێنن، بەڵکو تەنها گوتە و قسە چەسپاوەکانی تەسەووف بە هێند هەڵدەگرن و ئاگایانی لە واتا ڕاستەقینەکانی نیە، ئاگایان لەوە نیە کە لە کوێ دا سەرچاوەی گرتووە؟! و چۆن هاتۆتە کایەوە؟! و لەسەرەوەی تەسەووف چی ئامادەگی هەیە؟! و پێکهاتووەکانی لە چی دا خۆی دەدۆزێتەوە؟!!.

ئەو کەسانە کە تەنها لەناو تەسەووف دەڕوانن بەبێ ئەوەی بزانن چەمکی ڕاستەقینەی لە کوێ سەری هەڵداوە؟!! لەبەر ئەوە لە کتێبی تەسەووف دا تەنها تێگەیشتن یان وەرگرتووە لەو چوارچێوەیەدا، ئەگینا دوور لە کتێبی تەسەووف ناتوانن بڕ بکەن، لێرەدا جوداکردنەوەیەك دێتە ئاراوە، چونکە گومان لەوە نیە بەبێ شەریعەت مەحاڵە تەسەووف بێتە کایەوە، لەبەر ئەوە ئەم

تایەفەیــە تــەنها ئــەو واقیعانــە وەردەگــرن کــە ڕووکەشــن و لــە ڕاستیەوە دوورن و خۆیان بە واقیع ناوی دەبەن، ئەگینا گوزارشت لە واقیع ناکات، لەبەر ئەوە ڕووکەشانە لە تەسەووف گەیشتوون و نەچوونەتە بنج و بنەوانی بە تێگەیشتنی خۆیان مامەڵەی لەگەڵ دەکــەن، نــەك بــە تێگەیشــتنی خــودی تەســەووف وەك زانســتی سەربەخۆ، هەروەها هــەڵقولاَ و لــە گیــانی کۆمــەڵگای ئیسلامییەوە، بــەڵکو لێکدانــەوە و تێگەیشــتنیان بــە شــێوەیێ درێــژە دەکێشــی، دەگاتە ئەو ڕادەیەی بە ئارەزووی خۆیان لێکی بدەنەوە و چەندان واتــای دیکــەی بــۆ دروســت بکــەن لــە دەرەوەی خــۆی، بــە جــۆری واتاکــان پــەرە دەســێنێ، هــەتاکو واتــای دوایــی لەگــەڵ ئەســڵەکەدا جیــاواز دەکەوێتــەوە، بەهــەرحاڵ ئــەمان زیــاتر پشــت بــە کۆمــەڵێ مەســەلە دەبەســتن دوور لــە عەقیــدە و ئیمــان، لــە کاتێکدا وە نــەبێ خۆیان بڕوایان بە ئیمان نــەبێ، بەڵام ئــەوەتا قووڵ نین و بە تــەنگ دونیــاوە چــوون و لێــی ڕۆچــوون تــاکو ڕێ هەڵــدێرو هەڵەشــەیان گرتۆتــە بــەر، ئەمانــە بەمــە ناســراون کــە دڵیــان زشــت و ناپەســەندی بەدی هەڵگرتووە، هەتا لە ڕووانین بۆ بواری تریش بەهــەمان شێوە هەڵســوکەوت دەکــا، لەبــەر ئــەوە نەخۆشــییان هەیــە و نــاتوانن بــە تــەواوی بــە تــەنگ کــارە پەســەندەکان بچن لەمــەوە پێویســتیان بــە داودەرمانی ئیمانی ڕاستەقینە هەیە، بۆ ئەوانــەی دڵیان بــەردەوام گەرد و غوبار و زشتی بەسەرەوەیە، خودای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۗ.. ﴾[1].

ئەم تایەفەیە زیاتر بە نەزان و ڕووکەشکاران دەگوترێ، کە نایانەوێ قووڵ ببنەوە، هەروەها دڵیان بە ئاکارە ناپەسەندەکان و زشت و بەد پیس بووە، چونکە ڕوونە پیاوان و ڕێبەرانی تەسەووف بە ئاشکرا بیروڕاکانیان بلأوکردۆتەوە، هەموو سەرچاوەکان دیارن چۆن بە قووڵی باسی ئەحکام و بنەڕەتەکانی پەرستشیان کردووە جا سەرچاوە چ (الفتوحات المكية) و (الرسالة القشيرية) و.. چەندانی تر لەم ڕووەوە ویستویانە وشەکان تەواو مەغزای خۆیان بدا بە دەستەوە و گوزارشت لە خۆیان بکەن، نەك مەسەلەی لە ڕێ لادەر و زیادەڕۆی بخرێتە سەر و لەهەمان کاتیش بڕوای پێ بهێنرێ، لە کاتێکا ئەمە ڕەنگدانەوەی ئەوەیە کە لە دڵدا هەیە و پڕیەتی لە بەدی و زەشتی و ئاکاری ناپەسەند و دوور لە شەریعەت، جا چۆن بڕوا بە حەقیقەت دەست دەکەوێ.

---

١ - سورة ال عمران، الآية ٧.

ت) ئـەم بەشـە ئـەو كەسـانەن هەڵخەڵـەتاون و فريـودراون، تـەواوی ڕۆشـنبيری و كـەلتور و زانسـتيان لـە بنەڕەتـەوە وەرنـەگرتووە، بـەڵكو وەك لەمەوبـەر ئاماژەمـان پێـدا لـە ڕۆژهەڵاتناسـان وەريـان گرتـووە، ئـەمان وەك ڕوونيـان كـردەوە بـە ئامـانجێكی ديـاريكراو ئـەم كارەيـان كـردووە، و كارەكانيشـيان بـە پێـی ديراسـە بووە، بۆ ئـەوەی بنـەڕەت و پێگـەكان لـە بـەين ببـەن، ئەمـەش وای كـردووە تايەفەيـەك دروسـت بكـا لـە نێـو جەرگـەی كۆمـەڵگادا بيروڕاكانيـان بـە چەسـپاوی وەربگـری و نەيـەڵێ گفتوگـۆی لـەبارەوە بكـرێ، بـە جـۆرێ ئەمانـە دوا حيكمـەت بـن، هەرگيز نەتوانين لێ يان لابدەين.

گەر سـەرنج بدەين تـا ڕادەيـەك ڕۆژهەڵاتناسـان كاريـان كـردووە تاكو كۆمـەڵێ كـەس ڕازی بكـەن بەبيروڕاكانيان و لـە ڕاستەقينەيی دووربكەنـەوە، ئـەم خاڵـەش جێگـەی هەڵوەسـتە لەسـەر كردنـە، چـونكە ئێمـە بـەر لـە هـەر شـتێ دەبـێ ڕەچـاوی چوارچـێوەی و بنـەڕەتی شـەريعەت بكـەين، چـونكە بەرنامەيـەكی فرەلايەنەيـە و بەسـەرەوەی مرۆڤـە و جـوانی و مـەزنی لەوەدايـە بـەردەوام و لـە هەموو كات و ساتەكان مرۆڤی بەڕێوە بردووە و هەموو گرفتەكانی چارەسـەركردووە، ئـەو كەسـانەی گرنگـی ئـەم سنوورانە نـادەن" خۆيـان گـومڕان چـونكە درك بـە ڕاسـتييەكان ناكـەن و نـازانن لەبەرچـی ئـەم بـيرو بۆچـوونە نامۆيانـە هاتۆتـە ئـاراوە؟! وە چۆن دەيـەوێ تـۆوی نـاكۆكی لـەم كۆمەڵگايـە دروسـت كـا، ئـەگينا بـڕوا هێنـان بەڵگـەی تـەواو بەدەسـتەوە دەدا كـە ئـەمان دەسـتبەرداری گـومڕايی نـەبوون لەلايـەك و لەلايـەكی تـر ئـەم تايەفەيـە نـازانن كـە

کەلتوریٚ بەرێوەیە و دەیەویٚ کەلتوری پیرۆز لەبەین بەریٚ و گەشە نەکا و لە شوێنی خۆی بوەستیٚ، چونکە لە بەین بردنی باری ڕوحی کۆمەڵگا، هێدی هێدی بەرەو گرفتی دەبا و لەناوەڕۆکی مەزن و پڕ داهێنانی وشکی دەکا، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: (لا يزال طائفة من امتي ظاهرين حتى يأتيهم أمر الله وهم ظاهرون)[1].

ئەمانە بە ئاشکرا کار دەکەن و دیارن، بەلایانەوە لەسەر هەقن و ڕاستەقینە دەناسن، بەلاّم ئەمە تا سەر بەم جۆرە نامێنێتەوە، بەڵکو خودای گەورە ڕۆژی خۆی چارەسەریان دەکا و ڕێگەی خۆیان پێ نیشان دەدا، چونکە ئەمانە درك بە هەڵخەڵەتاندنی ڕۆژهەلاّتناسان ناکەن، نازانن لە پشت مەبەستیانەوە چی هەیە!! نازانن چ تەڵەیەك دانراوەتەوە، ئەمانە تووشی هەڵدێر هاتوون، لە کاتێکدا هەموو بەهاکانی کۆمەڵگای خۆیان لەدەست دەدەن و دەبنە پاشکۆیەك بۆ بەهاکانی کۆمەڵگایەکی تر، کە بەرنامەی کۆمەڵگای موسڵمانان جوانترین و ڕێك و پێکترین بەرنامەیە بۆ سەراپا ژیان و چارەسەری هەموو گرفتەکانی کردووە و مرۆڤایەتی دەپارێزێ.

---

١ – صحيح البخاري، ر: ٧٤٥٩، كتاب التوحيد، باب قول الله تعالى: ﴿ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَىْءٍ إِذَآ أَرَدْنَٰهُ ﴾ (النحل ٤٠) . (ئەم دەستەواژەی دیٚ هەڵەیە پێدا بچۆرەوە)

ئەم حەدیسە(بخاری) دەری هێناوە لە کتێبی(الإعتصام) باسی کردووە لە ڕاستی و دروستی دا و پاگژکردنەوەی، لە کتێبی (حقائق عن التصوف) وەرگیراوە .

ئـەم تایەفەیـە لەلایـەكی تـر بنـەماكانیان لەسـەر كـەلتوری دەرەوەی كۆمەڵگای ئیسلام دروست بووە و ناتوانن خۆیان پەرە بە خۆیـان بدەن، بەڵكو لـە دەرەوەی ئـەم كۆمەڵگایـە ئـەوەی هاتـە پێشەوە ئەمان زۆر زوو پێی كاریگەر دەبن و لـە كۆمەڵگای خۆیـان دوور دەكەنـەوە، بـەو پێیـە لەگـەڵ كۆمـەڵگای خۆیـان كـە تیایـدا هـەڵقوڵاون نـامۆ دەبـن و لـە كاریگـەر و كارتێكراوەكـان دا ڕۆڵیـان نـابێ و بـەردەوام لـەو گۆڕەپانـە لاوازە كـار دەكـەن كـە خـۆی لەناوەوەدا گۆڕانكاری بەرجەستە ناكا و بەلاوەی دەنێ.

# پێناسە پەسەند و پێناسە ناپەسەندەکان[1]

مرۆڤ دەبێ کارێك بکا، لەبەر ئەوە کارەکان دەدرێن بە مرۆڤ یاخود کارەکـان پێناسـن بـۆ مـرۆڤ، بۆیـە کارەکـان ئەوانـەی مـرۆڤ پێـی هەڵدەسـتن دابـەش دەبـن بەسـەر دوو جـۆردا، ئەمانـەش کـەلتووری تەسـەووف گـەلێ گرنگیـان پـێ دەدا، کارەکـان بـریتین لـە: (پێناسـە پەسـەندەکان و، پێناسـە ناپەسـەندەکان) بـەواتا (صـفات حمیـدة وصفات رذیلـة)، ئەمانـە لـە نـاخی مرۆڤدا هـەن وە ڕەگیـان داکوتـاوە، بـەڵام ئیرادەی مـرۆڤ دەکەوێتـە کـار بـۆ ڕێکخسـتنیان، بـە جۆرێـك لـە شەریعەت دا بۆ خودا کردنەوەی هێڵی حەرام و حەڵاڵ، کارەکان هەتا لە بابـەت (منـدب) و (مکـروه)، هەرچـی کـەلتوری تەسـەووفە وە لەبەر ئەوەی دەکێشێ بەناو ناخ و دەروونی مـرۆڤ و لـە ئـارەزوو و هـەوەس دوور دەکەوێتـەوە و بگـرە نـایهێڵی، لەبـەر ئـەوەی مامەڵـەی ڕۆژانـە نابێتـە کـاری سـۆفی مەسـلەك، بـەڵکو تـەنها و تـەنها لـە پێنـاو خـودا تێدەکۆشـێ، لەمـەوە تێدەکۆشـێ بـۆ ئـەوەی پێناسـە ناپەسـەندەکان بگۆڕێ بۆ پێناسەی پەسەند، تاکو لەناو ناخی مرۆڤ جێگری بکات و هەرگیز هەڵنەستێ و ببێتە کار و کـردەوە و زمـان و گوفتـاری مـرۆڤ و

---

[1] – سـوود لـە کتێبـی (تەسـەووف چـی یـە ؟!) ئـەمین شـێخ عـلاء الـدین نەقشبەندی وەرگیراوە، تەنها بۆ جوداکردنەوەی پێناسەکان، کە لـە بنچینەدا ئەمە بابەتێکی فرەوانی زانستی تەسەووفە، لێرەدا بەشیکردنەوەی زیاتر، تا بکرێ بە مەبەست و چڕ دەخرێتە ڕوو.

بە هیچ جۆرێ نەچێتە سەر کارو کردەوەی خراپ و ئەوانەی ئاماژە بۆ خراپی دەکەن و سەرچاوەیان لە نەفسی مرۆڤەوەیە، ئەو کاتە مرۆڤ دەبێتە دژی هەموو ڕەفتار و ڕەوشتێکی ناشیرین و چەوت، چونکە هیچ سانا نیە بتوانین ڕەگوڕیشەی کارە ناپەسەندەکان و پێناسە ناپەسەندەکان هەڵکێشن (گومانی تێدا نیە هەروا بە گاڵتە ناکرێت کە مرۆڤ ڕەگوڕیشەی حەسوودی لە دەروونی خۆیا هەڵ کەنێ، چونکە ئەو پێناسە بووەتە خدە و بە ڕەگوڕیشەی دەروونا چووەتە خوارەوە... ئەمەش پێناسێکی ناپەسەندە، بێ ئەوەی خۆمان بزانین بوەتە خوو و خدە بۆمان، وە حەز لەسەرکەوتن و پێشکەوتن و خۆش بەختیی خەڵکی تر ناکەین، وە ئەمانەوێ هەرچی خۆشی و چاکە بۆ خۆمانی تەرخان کەین، واتە زۆربەی ئادەمیزاد، نەك تەنها هەر پێی خۆشە خۆی لە هەموو کەس جوانتر، دەوڵەمەندتر، دەنگ خۆشتر، خوێندەوارتر، بە دەسەلاّت تر بێت، بەڵکو حەزیش ئەکات کەس نەگات بە قولە پێیا، وە ئەو کەسەیش کە لە شتێکا لەو زیاترە لێی داماڵرێت وە موحتاجی ئەم بێت)[1].

دەبینین لە مێژوودا گەر لەم دوو پێناسەیە بڕوانین هی وا بە هەڵەدا چوون و دوایی شتی گەورە یان کردووە، کە داوای خوایی و پێغەمبەرایەتی بێ، بەلاّم نوشوستیان (شکستیان) خواردووە، چونکە لە ناوەوەدا درۆزن بوون، یاخود هەر لە ژێر ئەم پێناسانە وە هەن کزی و بەندەیی و کۆیلەیی وا نیشان دەدەن بۆ خەڵکی تر، ئیتر بەم جۆرە دێنەکایەوە، لەمەوە دەردەکەوێ کە ئەم

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ل١٧٨ – ١٧٩.

پێناسانە هەن، بۆیە مرۆڤ لەمانەدا هەست بە پێناسەکانی خودی خۆی ناکات و تەنها خەوش و عاری خەڵکی تری لەبەرچاوە، پاش ئەوەی تەسەووف ئەم مەعریفەیەی بە گشتی زانی و لایەنەکانی ناسی، تێدەکۆشێت، بنج و بنەما و ڕیشەی ئەم پێناسە پەسەندانە لە دڵ و دەروون و ناخی مرۆڤ هەڵکێشیت، لەمەوە دەگەینە ئەم ئەنجامەی بێگومان ئەمە بەهۆی (موجاهەدە)ەوە دەکرێ، واتە خەبات لە دژی هەستە ناپەسەندەکانی (نەفس) کە بەگوێرەی ئایینی ئیسلام (هەروا کە "جیهاد" لە دژی کوفر و کافران فەرزە هەروایش "جیهاد" لە دژی ویستە ناپەسەندەکانی دەروونیش فەرزە... جارێك کە پێغەمبەری گەورە(ﷺ) لە جیهادێك گەڕانەوە، فەرموویان لە جیهادی (ئەصغەر) واتە بچووك گەڕاینەوە، جا نۆرەی جیهادی (ئەکبەر)ە، عەرزیان کرد، جیهادی ئەکبەر کامەتا ئەی پێغەمبەری گەورە، فەرمووی جیهادە لەگەڵ نەفسا، واتە لەگەڵ دەرخواستی ناڕەوای دەرونا، بێگومان بەربەرەکانی و خەبات لە دژی خواستی ناڕەوای دەروون زۆر گرانە، چونکە هەروا بە گاڵتە سەر ناگرێت)[1].

تەسەووف بۆ ئەم مەسەلانە سەرەتا هەموویان چ پێناسە پەسەندەکان و چ ناپەسەندەکانی دەست نیشان کردووە، پاشان دەرمانێکی بۆ داناوە کە هەرگیز سەر هەڵنەداوە و لە دەروون دا ڕیشەکێشیان بکات، بۆیە ئەم زۆر بە جوانی ناسیوە و تاقیکردۆتەوە، یەکە یەکە خەوشەکانی دیاری کردووە و دەستی

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ل١٧٩.

لەسەر داناوە، چونکە ناسیووتە هەستی خۆ بە زل زانین چی یە!! هەستی ناوی خەڵك بردن (غەیبەت) کردن چی یە!!.. هتد.

ئەم دەردانە گەلێ گرفتیان دروست کردووە، لەبەر ئەوە تەسەووف یەکەم ڕێگە بۆ چارەسەر کردنیان بڕیار دانە تاکو دەست لە هەموو شتێك هەڵگیرێت، ئەویش خۆی لە (تەوبە) کردن دەدۆزیتەوە، دەست هەڵگرتن لە هەموو خراپییەك، وە بڕیاردان لەسەر ئەوەی بە هەمیشەیی نەگەڕێتەوە سەری، بە گوێرەی (مەقام)ی تەسەووف (تەوبە) پلە و پایە پێکدێنێ (جا پاش ناسینی دەردەکان واتە پێناسە ناشیرینەکان، وە بڕیاردان لەسەر دەس هەڵگرتنیان، قۆناغی جێنشین کردنی پێناسە جوان و بە بەڵگەکان دێنە پێشەوە، واتە: تەنها ئەوە نیە، (بۆ نموونە) خۆت لە دەستی مشت قوچاوی و چنوکی ڕزگار کەیت، بەڵکو ئەبێ خۆیشت لەسەری بەخشندەیی ڕابێیت بە جۆرێ لەگەڵ چارەکردنی هەر نەخۆشییێکی دەروونی دا بکۆشیت بۆئەوەی پێناسە چاکەکەی پێچەوانەی ئەو، لە دەرونتا جێ گیرکەیت)[1].

بێگومان ئەم کارە خۆی لە خۆیدا گرنگە و کاریگەری هەیە، بەجۆری دەبێ بەردەوام ئاگاداری و ڕێنمایی هەبێت لە دوایەوە، هەروا زۆر سەختە و پێویستی بە تێکۆشانێکی بێ وچان هەیە و دەبێ پێداچوونەوەی ڕەوشت و ڕەفتار و کردار هەبێت، دەبێت مرۆڤ دان بنێ بەوەدا کە ئەو پێناسە ناڕەوایەی هەیە دەبێت خۆی لە دەستی قوتار بکات، لە جێی ئەودا پێناسە پەسەند دابنێ، لەم

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٠.

تێکۆشانەوە تەواوی ڕەوشە بەدەکان دەسڕێنەوە ڕێگای خواناسی تـەواو دێتـە دی، دڵ ڕوونـاك دەکاتـەوە و بـەهۆی زیکـرەوە (نـور) پەیدا دەبێ، (بەردەوام بوون لەسەر "ذکر" ئەوانەی خۆیان خاوەن "نـور"ن وە دڵیـان ڕونـاك بوەتـەوە، هـەر ئـەوان بـاش ئـەزانن ئـەو زیکرە چ دەرمانێکی گرنگە بۆ چارەی پێناسـی خـراپ وە ناشیرین کە لـە دەروون دا جێگیر بوە، ناوی خـوای گـەورە بردن چ بـە زوان وە چ بـە دڵ هـەروەکو ئـاگر بەردەیتـە خـەرمانی دڕکـو دال، ئـاوا دەروون لە خەوشی هەستە ناپەسەندەکان پاك ئەکاتەوە، بەڵێ بـەم چەشنە زۆری پـێ ناچـێ هـەروەکو کە نەخۆشێك بـەهۆی دەرمـانی بە کەڵکو باش چارە ئەکرێت، یان باغ و بێستانێك لە دڕك و هـەرێز و گیای زیان بار بژار ئەکرێت وە هەر وەکو خانوو ناو ماڵێك کە لـە خەوش و خاڵو تەپوتۆز پاك ئەکرێتـەوە وە شـتە بـە کەڵکـەکان لـەو باخ و ماڵەدا گەشە ئەکەن و دەر ئەکەون، هەر بەو چەشـنە دەرونـی سۆفی ڕاستەقینە لـە خەوشـی پێناسـە نـا شیرین و ناپەسـەندەکان پـاك ئەبێتـەوە و، وەکـو درەختێکـی بـاش بـەخێو کـراو و بـژارکراو ئـاودراو، دەس ئەکاتـە بەرهـەم دان، وە میـوەگرتن، وە خـاوەنەکـەی ئەحەسێتەوە، دیارە ئەوەش بەبێ ڕەنجو تەقەلا نابێت)[1].

لە تەسەووف دا دەرەجە بە هەموو پایە و پلەکانیەوە کە ڕێبوار دەیـبڕێ دەبـێ پێناسـە ناپەسـەندەکان لـە دەروون(نـەفس)دا ڕیشـە کێش بکرێن و لە جێگەی ئـەوان پێناسـەی پەسـەند جێگیر بکـرێ، کەئەمانیش خۆی لەمانە دەدۆزێتەوە:

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ل١٨٠ – ١٨١.

## أ) پـێـنـاســه پـهسـهنــدهكـان:

### ١) حەسەد:

بريتی يه لەوەی مرۆڤ حەز بكات بەوەی كه نيعمەتی مرۆڤێكی تر لابچێت، واته حەز كردن بە (زەوالی نيعمەت لە خەڵكی تر) كەواته پێی ناخۆشه ئەو نيعمەتەی هەيه، ئەمە لە زماندا، كەچی وەك زاراوە بە واته ئاوات خواستن بەوەی نيعمەتێكی دەست هاتووی شياوی كەسێكی تر لەلای نەمێنێ بە هەر هۆكارێك بێ، جا ئەگەر ئەمە داوا بكا بۆ خۆی، ياخود نەء، بەوجۆرە دەبينی كه نيعمەتی ئەوی تر بۆ خۆی لەسەر حيسابی نەمانی نيعمەتی كەسێكی تر[1].

خودای گەورە لە بابەت (حەسەد) دەفەرموێ:

- ﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴾[2].

- ﴿ أَمْ يَحْسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ﴾[3].

- ﴿ وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُوا۟ ۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ ۚ وَسْـَٔلُوا۟ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ ﴾[4].

---

١ – الشيخ الدكتور السيد بكر السيد عبدالرزاق السامرائي، قواعد الأخلاق في التصوف الإسلامي، ص١٧٣.

٢ – سورة الفلق، الآية ٥.

٣ – سورة النساء، الآية ٥٤.

٤ – سورة النساء، الآية ٣٢.

٢) (ڕیـــا):

(ریـا) لـه زمـان دا بـه واتـا ئـەوە دێـت: کـه شـتیٚ ببینـی بـه پێچەوانەی ئەوەی لەسەریەتی.

بەلاّم وەك زاراوە: نەبوونی دلّسۆزی له کاروباردا بەبیٚ پشت به سەرنجی خودا ببەستریٚ[1].

به واتـا خوداپەرسـتی بـه روکـار، تـەنها بۆ ئەوەی بزانن خـودا پەرسـتە، ئـەگینا لـه ناوەرۆکـدا وانیـه و تـەنها ئافـەرینی خـەلّکی دەویٚ و دەیـەویٚ هـەلّیان بخەلّـەتێنیٚ، لـه قورئـانی پـیرۆزدا باسـی ئەهلی ئەمانەی کردووە:

﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ٤ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ٥ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ٦ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ٧﴾[2].

(ریـا) نەخۆشـیەکی گەورەیـه لـه نێـو کۆمـەلّگادا، بـەجۆریٚ کەسایەتی تەنها هەولْ دەدا بەرەو ئارەزووەکانی بچیٚ و خودی خۆی دەرنەخا و به تەنگ کارە رواڵەتیەکان بیٚ، جا دەشیٚ (ریا) بۆ خۆی بـەگوێرەی پلـەوە بێتـه کایـەوە، خـۆی تیـادا لـه پێنـاو چـی و بۆچـی بەواتا سەرەتا موورادی ریا له ناو خۆیدا، پاشان لـه پێنـاو شـتێکدایه، به واتا له دەرەوەی خۆیدا، ئەمانەش پلەی (ریا) پێکدێنن.

جـا گرنگـه بزانین بـۆ چ مەبەسـتێك کەسـایەتی بـەم جـۆرە دێتـه کایەوە، دەیەویٚ (ریایی) بنوێنیٚ و هەموو مەسـەلەکان پشـت گـویٚ نـاخرێن، چـونکه گرنگـه مەبەسـتەکەی دواوەی بـزانین، هەرچـەندە بوونی (ڕیا) بەسه بۆ ناسینی.

---

١ – قواعد الأخلاق في التصوف الإسلامي، ص١٨٤.

٢ – سورة الماعون، الآية ٤ – ٧.

٣) (كـــبـــر):

خۆبەگەورە زانین و خۆت لە خەڵكی بە پێشتر بزانی بەبێ هیچ پێوەرێك، كەواتە مەبەستی سەرەكی ئەوەیە خۆت لە خەڵكی بە باشتر و گەورەتر بزانی.

ئەگەر وا دابنێن كە ئەم (كبر)ە تەواوی ژیانی مرۆڤایەتی گرتەوە، بزانین ئەم نەخۆشیە تەواوی خەڵكی داگیر كرد، حاڵ چۆن دەبێ؟!؟!.

هەموو خەڵكێ خۆی لە خەڵكی تر بە گەورەتر دابنێ چۆن دەبێ؟ ئەو كاتە هیچ ڕێز و ئیحترامێك بۆ كەسێك نامێنێتەوە و چ بەهایەك بۆ كەس نامێنێتەوە و كەسیش حورمەتی نامێنێ، كەس ئاداب نازانێ، جا گەر ژیانی مرۆڤایەتی بەو شێوەیەبێ بەبێ ڕێز و هەیبەت و حورمەت و ئاداب، مەحاڵە ژیان، ئەمانەش هەموویان بەشی گەورەی (كبر)ن [1].

جا گەڵێ بەش هەیە، خۆ بەگەورە زانین بەسەر خودا و پێغەمبەر و بەسەر عیبادەت و خەڵكی و... هتد، خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إن الذين يستكبرون عن عبادتي سيدخلون جهنم داخرين﴾[2].

---

١ – سعيد حوى، المستخلص في تزكية الأنفس، ص ١٩٥، دار السلام، ط ٤ – ١٩٨٨م.

٢ – سورة فاطر، الآية .

٤) (العجب):

بەجۆرێ دەڵێن (کبر) کوڕی "عوجب"ە، چونکە ئەویش خۆ پەسەندی زانین وە لەخۆبایی بوون دەگرێتەوە.

٥) (نفاق):

دوو ڕوویی کردن و خەڵك لە یەکتر بەردان، بەواتا ئەوەی لە ناخەوە هەیە جودایە لەگەڵ ئەوەی بە زمان دەووترێ، جا لێرەدا زمان حەقیقەتەکان ناڵێ و پاشان بۆ لەیەك هەڵنانی خەڵك دەیەوێ ئاژاوە دروست بکا، چ لە پێناو بارێکی کەسی یاخود بابەتی.

٦) (بُخل):

ڕەزیلی کردن، گلدانەوە، چنۆکی.

٧) (کذب):

لە زمان دا دژی ڕاستگۆیی دەگەیەنێ. بەڵام وەك زاراوە بەواتا هەواڵ دان لەبارەی شتێکەوە بە پێچەوانەی ئەوەی لە حەقیقەتدا هەیە، جا ئەگەر بەبێ مەبەست بێ ئەوا دەکرێ ببوردرێ، بەڵام ئەگەر بە ئەنقەست بێ ئەوە بێ هیچ گفتوگۆ حەڕامە [1].

---

١ – قواعد الأخلاق في التصوف الإسلامي، ص١٢٠.

٨) (خـــيـــانـــەت):

وەك زاراوە بـە واتـای كارێـك بـە ئەمانەتـەوە درابێتـە دەسـتت، بەلاَم بەبێ شەرع مامەڵەی لەگەڵ بكەی، جا بیفرۆشی یا قبڵی لێ بكەی یا كەمی بكەیەوە یا گلی دەیەوە [1].

لەم بارەوە خودای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٢٧ ﴾[2].

٩) (غـــەیـــبـەت):

ئەمەش لە بەشی ئەو كارە ناپەسەندانەن كە زمان دەیكا و جودایی دەخاتەكار، لەبەر ئەوە (لە پشت ملە ناوی خەڵك بردن بە شتێك، كە ئەگەر لە ڕوودا باسی كەیت ئەو كەسە پێی ناخۆش بێت)[3].

١٠) (بــێ وەفـــایـــی):

لـە مامەڵـە و هەڵسوكەوت دەردەكـەوێ، لەبـەر ئـەوە پابەنـدە بـە كاروبار كە كەسێ لە جیاتی پاداشتی چاكە بەخراپە وەلاَم بداتەوە و هەرگیز چاكەی لەبەر چاو نەبێ.

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٣.

٢ – سورة الأنفال، الآية ٢٧.

٣ – تەسەووف چی یە ؟ ل١٨٢.

١١) (غـــرور):

هەڵکێشان لە کاروباردا، بەتایبەتی کاتی دەسەڵاتێك دەگرێتە دەست و بێ باك دەبێ و چاوی سور دەبێ و گرنگی بە مەسەلەکان نادا.

١٢) (جـێـگـا خـواسـتـن) (جـاه طـلـبـي):

کەسی بەشێوازی ناڕەوا و ناپەسەند هەوڵ دەدا پلەوپایەی دونیای بە دەست بێنێ و بەو پایەی ناوەستی و بەردەوام هەوڵ دەدا.

١٣) (بـێ ڕەحـمـی):

بەزەیيت بەهیچ شتێکا نەیەتەوەو گوێ بەهیچ شتێ نەدەی و ئاکارەکان و کاروبارت توندوتیژ بنوێنی.

١٤) (تـظـاهـر):

لە (ریا)وە نزیکە و وەك ئەوە، بۆ کاروباری دنیای دێتە ئاراوە، بەڵام ریا لە (عیبادەت) دەبێ بۆنموونە: کاری چاك کردن نەك بۆ چاکەکردن، بەڵکو بۆئەوەی پێی بڵێن پیاوی چاکە (ئەنجامی کاری ڕەوا بۆ گەیشتن بە دەس کەوتی ناڕەوا)[1].

١٥) (وەقـاحـەت):

کارێك یاخود قسەیەك ئاماژە بەبێ ئابڕویی و بێ شەرمی بدا.

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٢.

**١٦) (تـەنـــەفـفـــور):**

هیچ شتێکی لاچاك نیە، پێومرێك نیە بۆ هەڵسەنگاندن بە قەوارەی خۆی بێ هۆکار ڕقی لە خەڵکە و دان نانێ بە هیچ چاکەیەکا.

**١٧) ( پــاداشــتــی چـاکـە بــە خـرا پـــە ):**

پاداشت دانەوە بە خراپە.

**١٨) (ئــاواتــی هەمـیـشـەیـی- طــول الأمل):**

بیر نەکردنەوە لە مردن، بەجۆری وا بژیت تەنها خۆت دەژیت و وا بزانیت پاش هەموو کەسێك دەمریت.

**١٩) (تــرسـنــۆکــی):**

پێچەوانەی ئازادیی و دەربەست نەبوونە.

**٢٠) (بــێ بــاوەڕیــی):**

باوەڕ نەبوون بە کەس، گومانی لە رادە بەدەر و دڵ پیسی تەواو.

**٢١) (غــەزەب):**

تـوڕەیی و هـەڵ چـوون بـە زوویـی، بـەبێ ئـەوەی دان بـەخۆت بگری و زوو دەمار بگری.

**٢٢) (قينەبەری):**

لە ڕقی خەڵك زیان لە خەڵك و خۆت بدەی.

**٢٣) (خدەی تۆڵە كردنەوە):**

نەبووردن دەگرێتەوە، جا لەمەوە كاری خراپ و بەد دێتەكایەوە، بەواتا (چاو پۆشی نەكردن لە هەڵەی خەڵك نەبوردن وە نە بەخشین، وە نە بوونی گوزەشت)[1].

**٢٤) (بێ قەولی):**

بەواتا پەیمان دان و پاشان جێ بەجێ نەكردنی چ بە زمان پاكردەوە، لەبەر ئەوە بایەخ بە بەڵێن دانان نامێنێ.

**٢٥) (قەتعی سیلەی ڕەحم):**

دووری گرتن لە خزم و كەسوكار، بەتایبەت باوك و دایك و برا و خوشك و ژن و منداڵ و لەمەدا خزمی نزیك مەبەستە.

**٢٦) (شەیدایانی ماڵ و سامان):**

بەواتا پارە كۆكردنەوە بەر لە هەرشتێك هەتا (حرص) دەگرێتەوە.

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٣.

٢٧) (زۆر بلێی):

بەواتا (الثرثرة) ئەم ئاکارە بە زمان دەردەکەوێ بە واتا هەڵەوەڕی و زۆر وتن و (لەغو).

٢٨) (نمیمە):

قسە گێڕانەوە دەگرێتەوە، بە واتا قسەی ئەم لای ئەو بگێڕێتەوە و قسەی ئەولا ئەم بگێڕێتەوە لە پێناو پێکدا گژانیان.

٢٩) (إنتقاد):

بەواتا ڕەخنەگیری، کە بڕێ کەس لەباتی ئەوەی بۆ عەیبی خۆیان بگەڕێن وە چارەی بکەن، هەمیشە ڕەخنە لە هەموو شتێ وە هەموو کارێ وە هەموو ڕەفتارێ ئەگرن [١].

٣٠) (إستکبار):

فەزڵ بوون بەسەر خەڵکی تردا، ئەمەش زۆر لە (کبر) نزیکە، دەتوانین بڵێین لەگەڵ (تەکەبور)دا یەك ڕیشەیان هەیە.

٣١) (کوفری نیعمەت):

بەو بەشەی کە خودا داویەتی ڕازی نیە، ئەمەش ئایەتی لەسەردا هاتووە، چونکە ئەوەی بەو بەشە ڕازی نەبێ کوفری کردووە و سزا دەدرێ.

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٣.

**٣٢) ( حب الذات ):**

خۆشەویستی خودی مرۆڤە کە بۆخۆی لە ڕادە بەدەر دەگرێتەوە، بە تەنها خۆی دەوێ و هیچی تری لەبەرچاو نیە.

**٣٣) ( تۆمەت لەم و لەو دان - إتهام ):**

خەڵکی تۆمەتبار بکەی، ئەمەش لە (إنتقاد) و (غەیبەت) نزیکە.

**٣٤) ( لەجاجەت ):**

واتە تەسلیمی حەق نەبوون و ئینکاری کردنی لە کاتێکدا بۆی دەرکەوتووە و خۆی بەدەستەوە نادات و هەرگیز دان بە هەق و ڕاستەقینە نانێ.

**٣٥) ( سارد و سڕی لەسەر خواپەرستی ):**

وەك ئەوەی فەرزەکان بە زۆر کرابن بە ملتەوە و کەم شەوقی بۆ عیبادەت.

**٣٦) ( تەمەللوق ):**

بەدرو حەوحی بکەی و چاپلوسی بکەی و ستایشی بکەی بۆ مەبەستێکی بەد.

**٣٧) ( إصرار ( بەردەوامی ) لەسەر گوناه ):**

لێرەدا ئەبێ بڵێم گوناه خۆی گوناهە، وە گوناهکار تاوانبارە، بەڵام فەرق هەیە لە نێوانی کەسێکا کە بکەوێتە ناوی گوناهێکەوە و دڵە تەپەی پێ بکەویت و پەشیمانی ڕووی تێ بکا، لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە (إصرار)یان (بەردەوامیان) لەسەر گوناه بێت، وەکو ئەوەی (ئەزەر) حەرامە، بەڵام ئەگەر بە هەڵە و ڕێکەوت[1] (یەکەمجار) بوو بەدەستی خۆت نیە، جا کە دووبارە و سێ بارەت کردەوە، ئەوە تاوانە وە ئەبێتە (إصرار) کە هەرگیز شێوەی(کاری) پیاوچاکان نیە [2].

**٣٨) ( ناپاکی دەروون ):**

لە ناخی دا ئەو هەستە دروست بووە و نیگای ڕەشە بەرامبەر خەڵك.

**٣٩) ( بێ حەیایی ):**

نەسڵەمینەوە و گوێ پێ نەدان.

**٤٠) ( بێ ئیعتمادی ):**

بەواتا پشت نەبەستان و دڵەتەپە.

---

١ – ڕێکەوت بە عەرەبی واتا : صودفە، صودفەش وشەیەکی کوفریە، واتە لە دەرەوەی قودرەتی خودایە و خۆی بووە بەبێ خودا، ئەم وشە لادە یان بیگۆڕە.

٢ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٤.

## ب) پـێـنـاسـه پـهسـهنـدهکـان:

### ١) ( پێ خۆش بوونی خۆشی و سەرکەوتنی خەڵك ):

ئەمە بە تەواوی پێچەوانەی حەسوودی یە، لە کاتێکا مرۆڤ دەزانێ حەسودی ڕیشەی هەیە بیر دەکاتەوە بۆ ئەوەی ئەمە نەهێڵێ، چونکە حەسوودی زیانی هەیە چ لە بەرامبەر خودادا و چ لە کۆمەڵگادا، خودای گەورە ئاماژەی پێ کردووە و بەجوانی ڕوونی کردۆتەوە، کە لە سەرکەوتنی خەڵك و پێ خۆش ببوندا، تەواو پێوەرەکان ڕاستەقینەیی خۆیان وەردەگرن، (خوا خۆی چاك ئەزانێت، وە هەموو شتێ بە تۆرەیە و هەموو کارێ بکات و ساتی خۆی بۆ دانراوە، ئەڵبەتە ئەگەر حەزبەوە بکەیت، تۆیش ئاوا لە نیعمەتی خوا بەر خوردابین، ئەوە (غیبطة)یە وە خراپ نیە، بەڵام پێ خۆش بوونی (زەوالی نیعمەت) لە خەڵکی تر، ئەوە خراپە)[1].

لەمەوە حەسەد لە (حقد) رقەوە دێتە بوون، بەڵام پێ خۆش بوون لە پاکێتی دڵ و دەروونەوە سەرچاوەی گرتووە، کە ڕق لە ئەنجامی توڕەیی یە کە ئەویش بەشی خۆیەتی و توڕەیش سەرچاوەیەتی[2].

چارەسەرکردنی لە دەرووندا ئەمە قۆناغێکی گرنگە و دەبێ خۆی بەسەر ئەم هەستە زاڵ کا، لەمەوە دەروون پاك دەبێتەوە و وشەکان، ئاکارەکان، ڕەفتارەکان، کردەوەکان بە ڕاستەقینەیی دەبینی و هەڵیان دەسەنگێنی و بۆ تەواوی مرۆڤ بەسوود دەبێ،

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٤.

٢ – المستخلص في تزكية الأنفس، ص١٧٥.

چونکە حەسودی شتێکی ناپەسندە و دەستووری پێ دراوە کە کارێکە قین و بوغز و دڕدۆنگی دەخاتە ناوەوە و مارێکە بەرەو دونیای ناپەسەندیمان دەبات بۆ ئەوەی کردەوەی بەد و زشت ئەنجام بدەین، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەوا داهێنان دێنێتە کایەوە و خۆشی بەرپا دەکات و واتای مرۆڤایەتی دەبەخشێ.

٢) (ڕیایی نەکردن):

خواپەرستی هەر لەبەر ئەنجام دانی باوەڕ بوون بە دەستووری خودا و چاکەکردن لەبەر ئەوەی چاکە، چونکە خودا پێی خۆشە[1]. چونکە لێرەدا وا پێوەرێکی مەزن بۆ چاکە و کارە پەسەندەکان دێتە ئاراوە، هەموو کەسێ دەست بە چاکەکردن بکا و ئەو هەستەی لا دروست نەبێ کە چاکە نەکا تاکو بەرامبەری چاکە نەکا، بەڵکو لێرەدا پەیوەندییە لەگەڵ خودای گەورە و چاکە لەوێدا حیسابی بۆ دەکرێت و لە پاشان دا لە کۆمەڵگا بەهای چاکەکردن دەزانرێ، بەڵام ئەسڵ ئەوەیە بەبێ ئەرزش لە پێناو خودا دا بیکەی.

---

١ - تەسەووف چی یە ؟ ل١٨٤.

**٣) (تواضع):**

ئەمە لە ڕووی وشەوە بەواتا ڕوونی و سادەیی و بەدەرخستن دێ، لە ڕووی زاراوەوە بەواتای خۆ بەزل نەزانین دێ، چونکە ئادەمیزاد هەموویان وەك یەكن، وەك یەك خەلق کراون، هەموویان یەك پێکهاتەیان هەیە و هیچ جیاوازییەك لە نێوانیان دا نیە، جا بۆچی جیاوازی بکرێ، مرۆڤەکان هەموویان خودای گەورە لە (پێغەمبەر)ئادەمەوە(ﷺ) خەلقی کردوون و (پێغەمبەر) ئادەمیش لە قوڕە، جا بۆچی مرۆڤ خۆی لە مرۆڤی تر بە زل بزانێ؟!. ئەمە لە خودی ناپەسەندەوە سەرهەڵدەدا، پێویستە مرۆڤ خۆی بە زل نەزانێ و تەواو خۆی بناسێ، چونکە هەستی خۆ بەزل زانین نەفی ئەوە دەکات مرۆڤەکان وەك یەکن و ئەمیش ئاکارێکی باش نیە و هەروەها کۆمەڵگاش تێك دەدات، دەبێ بزانین مرۆڤەکان هەموویان وەك یەکن تەنها ئەوەی لێکیان جودا دەکاتەوە لە ڕووی تەقوا و عیبادەتەوەیە، خودای گەورەیش ئاماژەی پێ کردووە ﴿إن اكرمكم عند الله اتقاكم﴾[1]. بەڕێزترینیان ئەوکەسەیە کە تەقوای زیاترە و لە عیبادەت هەڵدەکشێ، چونکە واتای تەواو هەموو پێناسە پەسەندەکان لە خۆ دەگرێ و مرۆڤ لە بەدەکان دوور دەخاتەوە.

---

[1] – سورة ، الآية .

٤) (خۆبەكەم زانین)[١]:

ڕوانین بە عەیبەكانی خود دا، جا دەبێ لە هەموو بارێكدا بێت، ئەم هەستە دەبێ دروست كرێ بۆ بنیادنانەوەی كەسایەتی مرۆڤ تاكو پێناسە پەسەندەكان دەروونی ڕووناك كاتەوە.

٥) (خێر ویستن):

لە هەموو بارێكدا دێتەكایەوە، چ بەوەی بەردەوام ئەم ئاكارە پەسەندە بكەی چ بەهۆی ئەوەی خەڵكی ئاشت كەینەوە.

٦) (بەخشندەیی):

بەخشندەیی ئاكارێكی بەرزە، مرۆڤ دەبێ لەبەرچاوی بگرێ بەرامبەر مرۆڤەكانی تر و مشت كراوەبێ.

٧) (ڕاستگۆیی - صدق):

پێچەوانەی درۆ كردنە، لێرەدا ڕاستگۆیی مەسەلەكان بەچاوی ڕاستەقینە سەیر دەكا، جا گەلێ بەشی هەیە، دیارە گرنگترنیان ڕاستگۆیی لەگەڵ خودا دایە، ئەوەتا دەفەرمووێ:

﴿ رِجَالٌ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ ﴾[٢].

---

١ – لەسەرەوە باس كرا لە (تەوازوع) ئەمە دووبارەیە، دەتوانی یەكیان خەی.

٢ – سورة الأحزاب، الآية ٢٣.

ڕاستگۆیی و ڕاستگۆ یەك بابەتن، خودای گەورە لە زۆر سوورەتەکان باسی کردووە، ئەوەتا دەفەرمووێ:

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ﴾[1].

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴾[2]. ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ﴾[3].

حەقیقەتی ڕاستگۆیی وەك واژە بە گەلێ واتا بەکاردێ، وەك ڕاستگۆیی لە قسە و گوفتاردا، ڕاستگۆیی لە نیەت و ئیرادەدا، ڕاستگۆیی لە کرداردا، ڕاستگۆیی لە پەیماندا، ڕاستگۆیی لە بەجێ هێنانی پایەی ئاییندا، لەبەر ئەوە مرۆڤی ڕاستگۆ دەبێ هەموو واژەکان هەڵگرێ و تیایدا ڕەنگ بداتەوە[4].

**٨) (لە پشت ملە چاکەی خەڵك گوتن):**

ئەم ئاکارە دژی بەدی و غەیبەتە، چاکەی خەڵك بڵاوکردنەوە، ئاکارێکی پەسەندە.

**٩) (ئەمینداری):**

---

١ – سورة مريم، الآية ٤١.

٢ – سورة مريم، الآية ٥٤.

٣ – سورة مريم، الآية ٥٦.

٤ – المستخلص في تزكية الأنفس، ص٢٧٠.

بــەواتا دەســـت پــاکی، لــەکاروباردا بەدەردەکــەوێ، ئەمــە پێچەوانەی خەیانەتە، بەواتا لەوکارەی پێت سپێردراوە ئەمانەت تیایدا بالاّ دەستە.

١٠) (وەفاداری - الإخلاص):

لە ڕووی وشە بە واتای تەنهایی و بێ خەوش دێ، چونکە هیچ بەوی و فرت و فێڵی تێیدا نیە، لەبەر ئەوە کاری پاك پێی دەگوتری (وەفاداری) لەم ڕووەوە خودای گەورە دەفەرمووێ:

﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِي ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّٰرِبِينَ﴾[1].

لەبەر ئەوە ئیخلاص بەپێچەوانەی (شرك)ە کە هەردووکیان شوێنیان لە دڵ دایە و پابەندە بە مەبەست و نیەت [2].

لێرەدا ئەو سنورە هەیە، کە تەنها ترسان بۆ خودای گەورە و دەبێ بیر لەوەدا ئابلۆقەبێ لە تۆڵەی خوا ترسان.

---

١ – سورة النحل، الآية ٦٦.

٢ – المستخلص في تزكية الأنفس، ص٢٦٦.

**١١) ( ڕازی بوون و دامرکان به بەشی خوا ):**

دووری گرتن کە خەڵك بکەیتە پەیژە بۆ سەرکەوتنی خۆت، دوری گرتن لەوەی کە لەسەر حیسابی خەڵك بگەیت بەپایە، وە باوەڕ لەسەر ئەوەی کە ئەبێ بە تێکۆشانی ڕەوا مافی خۆت بدرێتە دەست، واتە بەو ڕادەیە کە زانست و ئامادەیی و کارناسی و توانابیت هەڵ ئەگرێت، نەك لە توانایی و زانستی خەڵك بۆ سوودی خۆت کەڵك وەرگریت[1].

لەمەوە دەزانین خودای گەورە ئەم هێڵەی بۆ ئەوە داناوە تاکو ئاکارو بەدەکانی دەروون ڕەش کاتەوە و دڵەکان پاك کاتەوە، چونکە لە جیهان دا بەشەکان وەك یەك نین، لەبەر ئەوە دەبێ مرۆڤ بە بەشی خۆی ڕازی بێت، چونکە ئەم بەشە خودای گەورە بۆی داناوە و پێی ڕەوا بینیوە، ئەمەش مافی خۆیەتی، ڕەنگە بەگوێرەی کات و زەمەن بگۆڕێت.

**١٢) ( خاوەن بەزەیی ):**

خودای گەورە فێری بەزەییمان دەکات، فێرمان دەکات کە ئەمە ئاکارێکی پەسەندە و خۆشی دێنێتە کایەوە و دڵەکان ڕۆشن دەکا، لەمەوە بە تەنگ چەوساوە و بێچارە و لێ قەوماوان دەچین و خەم لە خەڵك دەخۆین.

---

١ - تەسەووف چی یە ؟ ل١٨٥.

۱۳) ( چاكه لەبەر چاكەكردن )؛

نەك بۆ خۆ هەڵكێشان لەناو خەڵك، واته بۆ (تَظاهُر) نەبێ، هەر له دەروونەوه ئەو چاكه كردنه سەرچاوه بگرێت، واته (إخلاص)[1] لەمەوه بۆ كاره پەسەندەكان داوای بەرامبەری ناكەین لەو دونیا، ئەمە كارێكە پەیوەندی بە نێوانی مرۆڤ و خوداوه هەیه و هاوكێشەیەكی گرنگه له پێناو چاكه له پێناو چاكەكردن.

۱٤) ( شەرم و حەیا كردن )؛

بەو پێیەی پایەكان و پلەكان له كۆمەڵگا وەك یەك نین، لەبەر ئەوه پێویسته ڕوانینمان بەڕێزو كەرەمەوه بێت، دەبێ خاتر بگرین له ڕووی خەڵكا، ئەمە واتای ماف فەوتان نیه، بەڵكو هەندێ جار دەست له مافی بچووك هەڵدەگیرێ له پێناو هی گەورەتر.

۱٥) ( خۆشەویستی - مەحەبەت )؛

لەڕووی وشەوه ئەو ئیرادەیە دەگەیەنێ كه چ دەبینێ یاخود پێی وایە خێرو چاكه بە ئەنجام دەدا، ئەمەش چەند ڕوویەكی هەیە، بەتایبەتی له زمان دا وەك:

۱) خۆشەویستی لە ئارەزوودا، وەك خۆشەویستی پیاو بۆ ئافرەت ئەوەتا خودای گەورە دەڵێ:

﴿ قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّاۖ ﴾[2].

---

۱ - تەسەووف چی یە ؟ ل۱۸٥.

۲ - سورة یوسف، الآية۳۰.

ب) خۆشەویستی بۆ سوود وەرگرتن، وەك خۆشەویستی بۆ شتێك كە تیایدا ئەنجامی سەرەكی سوود وەرگرتنە، ئەوەتا خودای گەورە دەفەرمووێ:

﴿وَأُخۡرَىٰ تُحِبُّونَهَاۖ نَصۡرٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتۡحٞ قَرِيبٞۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾[1].

ت) خۆشەویستی بۆ فەزڵ و كەرەم: وەك خۆشەویستی ئەهلی زانست، كە لە نێو خۆیاندا هەندێك یا كەسێك لە كەسێكی تر زیاتر خۆش دەویستری"[2].

خۆشەویستی گەلێ پێناسەی لەخۆگرتووە، بەلأم بەگشتی دەروازەیان خۆشەویستی بۆ خودای گەورەیە.

**١٦) (ئەدەب كردن):**

واتا رێزگرتن لە نێو كەسەكان دا و دوور كەوتنەوە لە هەڵەشەیی، چونكە دەبێ گەورە و بچوك بفامین و لە بەندەكانی خودا حەیا بكەین.

---

١ – سورة الصف، الآية ١٣.

٢ – قواعد الأخلاق في التصوف الإسلامي، ص٢١٩.

**١٧) ( پاداشتی چاکە بە چاکە ):**

لەبەرامبەر هەر چاکەیەك دا دەبێ چاکە بدرێتەوە وەك پاداشت، تەنانەت هەندێ جار پاداشتی خراپەی بە هەڵە کراو و لە رێی نەفامیوە کرا و، لە هی خۆت بچووکتر، بەچاکە بدرێتەوە رێگەی راستەقینەیە.

**١٨) ( لەبەر چاو بوونی مردن ):**

وورد بوونەوە لە پێشینان (هەر وەکو کە لە زۆر شوێنی قورئان دا خوای گەورە سەرگوزشتی وەکو فیرعەون، قەومی عاد، قەومی نوح، وە"پمود" قەومی لوگ، ئەگێڕێتەوە کە ئێمە لەو جۆرە سەرگوزشتانە عیبرەت وەرگین وە لە خۆمان بایی نەبین، پێ هاتن بەوەی کە مردن، هەروا کە هەمیشە لە هەموو کەسێکی ترەوە نزیکە، لە تۆیشەوە نزیکە، نەك لات وابێت خەڵك بمرێت، بەلاّم تۆ هەر پایەداربیت)[١].

**١٩) ( ئازادیی ):**

باوەڕ بەوەی خوا نەیکات ناکرێت، لەبەر ئەوە دەبێ مرۆڤ بەرامبەر ستەم بێتەگۆ و ئازادیی نیشان بدا، تەنها دەبێ لە خوا بترسێت، تەنها بۆ حەقیقەت سەر لەبەربێت.

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ل١٨٥ – ١٨٦.

٢٠) (نابىٚ مرۆڤ دڵ پیس و نا باوەڕپێت):

دڵ پیسی ئاکارێکی ناپەسەندە، دەبیٚ مرۆڤ خۆی لیٚ بەدەرخا، چونکە وەك خودا ڕوونی کردۆتەوە هەندیٚ بەدگومانی گوناهە، ئەمەش دەبیٚ لەبەر چاو بێت، خودای گەورە دەفەرمووێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ﴾[1].

٢١) (ئارامی و لەسەر خۆیی):

دووری گرتن لە توڕەیی و ئارامی نواندن و بەهیچ جۆریٚ هەوڵ نەدەی دڵی خەڵك بخەیتە ئازارەوە، چونکە زۆر جار توڕەیی کاری وا دەکات کە دوورە لە عەقڵ و ئاکاری پەسەند، لەبەر ئەوە پەشیمانی لە دواوەیە، لەبەر ئەوە دەبیٚ بەسەر توڕەیی زاڵ بین تاکو ئارامی و لەسەر خۆی بەدی بهێنین.

٢٢) (ڕقەبەری نەکردنا):

لیٚ بوردن تەومەری گرنگە بۆ مرۆڤ، دەبیٚ مرۆڤ پاکبیٚ ڕشتەکان لە دڵ هەڵنەگریٚ و چاو بپۆشی و نابیٚ لە ڕقی ئەم و ئەو زیان لە خۆی بدا.

---

[1] – سورة الحجرات، الآية ٦.

**٢٣) (بەخشین و لێ بوردن):**

چـــونکە تۆڵەکردنـــەوە هەمیشـــە، تـــۆ لەکردنـــەوەی تـــری بەشوێنەوەیە، وە هەتا هەتایە لە کۆڵی مرۆڤ نابێتەوە، ئەمە بەو مانایە نیە کە دەس لە ماڵی خۆتو مافی خۆت هەڵگری، بەڵکو خوای گەورە فەرموویتی:

﴿ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ ﴾[١].

بەڵام سەبارەت بە کوشتنەوەی قاتیل خودای گەورە دەفەرمووێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَىۖ ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰۚ فَمَنْ عُفِيَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍۗ ﴾[٢].

کەواتە باوەکو مرۆڤ خاوەن مافیش بێت، وە تۆ لە کردنەوە هەقی خۆی بێت، بەخشینەکە لای خوا پەسەندترە[٣]. لەبەر ئەوە تەسەووف بەشوێنی چاکترین دەگەڕێ و دەیەوێ دونیا خاڵی بکا لە بەدەکان، لەبەر ئەوە دەبێ لە هەستی ناپەسندی تۆڵەسەندنەوە دەس هەڵگرێ، تەنانەت ئەوەندەی دەکرێ هەتا ئەگەر مافی خۆیشی بێ، نەك مافی خەڵکی تر، لەبەر ئەوە چاو پۆشین پەسەندترە، کەواتە (بەخشین) لە ئاکارە زۆر پەسەندەکانە.

---

١ – سورة المائدة، الآية ٤٥.

٢ – سورة البقرة، الآية ١٧٨.

٣ – تەسەووف چی یە ؟ ل١٨٧.

**٢٤) (لەبەردەوام بوون و سووربوون لەسەر بەڵێن):**

ئەم هەستە، یەکێکە لە گرنگترین و بگرە گەورەترین پێناسە پەسەندەکان، لەبەر ئەوە بوونی بەڵێن حەدێکی گرنگە بۆ بوونی کەسایەتی و پێناسەی، جا لە ڕووگەی تەسەووفەوە ئەمە خاڵێکی یەکلاکەرەوەیە بۆ ڕێبەر چووە ڕۆیشتن لەسەر بەڵێنی خۆی هەموو واتا مەزنەکان بەدەست دێنێ.

**٢٥) (دیدەن کردن):**

دەبێ ڕێبوار ئەم پێناسەیە لە دڵ و دەروونیا جێگر بکات و بۆ تەسەووف گەڵێ گرنگە، کەواتای سەرلێ دان و بە تەنگ کەسوکار هاتن دەگەیەنێ، کەواتە گەیاندن و بەزەیی بەرامبەر ئەوی تر دەگەیەنێ، وەك (صیلەی ڕەحم).

**٢٦) (زوهد):**

گومان لەوە نیە کە (زوهد) پایەیەکی سەرەکی یە لە ڕێڕەوی تەسەووف جا بە پێچەوانەی ئەمە کاتێ هەوڵ دەدرێ بۆ کۆکردنەوە و پێکەوەنانی سامان بە رادەیەك تەنها ئامانج لەوەدا دەبێ، ئەوا بیرکردنەوە و هەرچی لە قەوارە هەیە بۆ ئەمە تەرخان دەکرێ، هەروەها دەبێ بزانین کاروکاسبی و سەرمایەی حەڵاڵ کارێکی باشە، بەڵام (إنهاك) واتە خۆ هیلاك کردن و خۆ پڕوکاندن بۆ بەدەست هێنانی سامان، ئەمەش پێچەوانەی ڕەوشت و ڕەفتاری سۆفیەکانە، لەبەر ئەوە (زوهد) دەرمانێکە بۆ لەناوبردنی (إنهاك).

٢٧) (کەم گوتن):

خۆ تیٚ هەڵ نەقوڵتاندنی شتێك کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە مرۆڤەوە نەبێت، ڕەوشتی پەسەندی سۆفیەکانە، ئەوان ئەڵێن تا پرسیارت لیٚ نەکراوە مەڵیٚ، کە پرسیارت لیٚ کرا بە ئەندازەی پێویست بڵیٚ" چونکە کەم وێژی، دەبیٚ دەنگی و بیٚ دەنگی، لەوە وشە بەرزەکانی خواناسانە، بەلاٚم هەڵە وەری و زۆر بڵێیی (لەغو) ڕەوشێکی ناپەسەندە و لە قوڕئانیشا نەفرینی لیٚ کراوە و ستایش کراوە لەوانەی خۆیانی لیٚ لائەدەن[1].

٢٨) (قسەی ئەم، لای ئەو نەکردن):

نابێت لەکاروبارو گوفتاری تر خۆمان هەڵقولێنین، ئەمەش یەکێکە لە ئاکارە پەسەندەکان.

٢٩) (ڕەخنەی بنیادنەر):

ڕوونەکە کاری ڕەخنەگرتن زۆر جار کاردەکاتە سەر دڵ و دەروون و ئەشکەنجەی لیٚ وەبەردیٚ، بەلاٚم نابێت لە ڕەخنەدا ئەم ئاکارە بێتە ئاراوە، بەڵکو دەبیٚ ڕەخنە دروستکەر بیٚ، بەبیٚ ڕەوش و دابونەریتی خۆی، بەلاٚم ڕەخنەگرتن و ناڕەزایی لای ڕێبواری ڕێڕەوی تەسەووف ناپەسندە و لیٚ دوورە پەرێزن.

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ل١٨٧ .

٣٠) (دژی خۆبەزل زانین):

بەلای رەوش و رێڕەوی سۆفیانەوە هەستی خۆ بەکەم زانین و خۆبە هیچ زانین پەسەندە، بەتایبەت بەرامبەر گەورەیی خودا، چونکە بەلای ئەوانە وە خودا هەر گەورەیە و بۆوی باشە و بۆوی چاکە، چونکە ئێمە خاوەن دەسەڵات نین، جا هەر چەندە بە دەسەڵات نین، ڕۆژێ دێت نەمێنین، لەبەر ئەوەی گەورەیی (إستکبار) بۆ نەبدە نەهاتووە، کەسی سەرەتای خاك بێت و کۆتایی هەر خاکە.

٣١) (شوکری نیعمەت):

ئەو بەشەی بەدەست هاتووە پێی شوکر بین، ئەوە کارێکی پەسەندە، و خوای گەورە بە شوکر بوون بەش زیاد دەکا، لەبەر ئەوە دەفەرمووێ:

﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ﴾[١].

---

١ - سورة إبراهيم، الآية ٧.

**٣٢) ( نكران الذات - ايثار ):**

بەوە دەڵێن دەست لە قازانج وە یان ئاسایشی خۆی هەڵگرێت لە ڕێی خۆش بەخت کردنی خەڵکو دابین کردنی خۆش بەختی و کامەرانی و قازانجی خەڵکا، ئەم خۆبەخت کردن و دەس لە خۆشی خۆ هەڵگرتنە یەکێکە لە پێناسە پەسەند و تایبەتەکانی پەیڕەوانی تەسەووف، خودای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾[١].

خوای گەورە لە تەعریفی ئەنصارا، یان بڕێ لە موهاجیریندا کە یارمەتی برا موسڵمانە بێ دەسەلاٌتەکانی خۆیانیان داوە ئەفەرمووێ: (هەر چەن خۆیان ئیحتیاجیان بو بەو شتانە وە پێویستیان بو پێیان لەگەڵ ئەوەشا فەزڵی برا دینیەکانیان ئەدا بەسەری خۆیاندا)[٢].

**٣٣) ( بەرگری لە هەق ):**

بەرگری کردن لە هەق پێناسێکی پەسەندە و دەروون ئارام بەخش دەکا، و هەستێکی پەسەندە، لەبەر ئەوە بەرگری لە هەق دەبێ ببێتە جێنشینی تۆمەت لەم و لەودان و خەڵك تاوانبار کردن.

**٣٤) ( واقیعیەت ):**

---

١ – سورة الحشر، الآية ٩.

٢ – تەسەووف چی یە ؟ ل١٨٨.

واقیع بینی دەگەیەنێ، بەواتا لەبەرامبەر هەق هەموو شتێ دەوەستێ و دەبێ خۆمان بە دەستەوە بدەین.

٣٥) (گەرم و گوڕی لە خواپەرستی):

بەردەوام بوون لەسەر خواپەرستی و پەرستش گەرم و گوڕی هەروا بە پێناسەی پەسەندی گرنگ دەژمێردرێ و بوونی زۆر پێویستە.

٣٦) (واقیع بینی):

هەق دان بە گوفتار و کرداری خەڵك بەو جۆرەی کە هەڵ ئەگرێ نە زیاد نەکەم[1].

٣٧) (پاکی دەروون و پاکێتی):

پاککردنەوەی هەموو ناخ هەرچەندە ئەمە لەگەڵ پێناسەکانی تر یەك دەگرێتەوە، بەلاَم بوونی چ وەك ڕێگا و چ وەك ئامانج گرنگە.

٣٨) (حەیاداری):

رێ هەڵگرتن لەسەر تێك نەدانی دا بەگرنگەکان لەسەر پەرستش و کەسایەتی.

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٩ .

**٣٩) (تەوەككول):**

پشت بەستن بە جۆرێ کە تیایدا بە تەواوی بڕوامان پێ هەیە.

گەلێ پێناسەی تر هەن، چ ناپەسەند و چ پەسەند، بەلاّم خالّی گرنگ تیایدا جێ نشین کردنە لەناو دەروون.

# علم اليقين ، عين اليقين ، حق اليقين

تەسـەووف جیهـانێکی گـەلێ فراوانـە، گوزارشـتە روحیـەکان بەجۆرێ تیایدا قوولْ بۆتەوە، کە هاوشێوەی بەدی ناکرێت، ئەم زاراوانەی وەك (علم اليقين)و (عين اليقين)و (حق اليقين) دەتوانین بڵێین تـەنها تایبـەتن بـە تەسـەووف، بۆخۆیـان مـەغزای سـەربەخۆ بەدەستەوە دەدەن، بەو پێیەی تەسەووف لە جیهانی روحیدا دایە و گۆڕەپـانێکی فرەوانـی گرتـووە، لەبـەر ئەمـە گوزارشـتەکانی پابەنـدە بـە باوەڕ تیایـدا، کـە ئەمـەش قۆناغێکە نابێـت نـەك هـەر فەرامۆشی بکەین، بگرە بۆخۆی لەسەر ئەمە پابەندە و کشاوە، جا لـەم زاراوانـە، بـەر لەهـەر شـتێك دەبـێ بـزانین ئەمانـە بـە تـەنها گوزارشـتی دیکـە دەدەن بـە دەسـتەوە، بـەڵام ئایـا لـە جیهـانی تەسـەووف بـە تـەنها چ گوزارشـت لێ دەکـەن؟!! چ جیاوازییـەکی لەگـەڵ دەرەوەی خـۆی- تەسـەووف- هەیـە؟!! بـە یەکـەوە چ گوزارشـتێك بەدەسـتەوە دەدەن؟!! پەیوەنـدییان بـە باوەڕەوە چـی یـە؟! چ رێڕەوێـك وێنـە دەکێشـن؟! چـۆن پلـەیان دەسـت نیشـان دەکـەین؟!! ئایا هـەر لـەناو تەسـەووف رەسـم دەکێشـن یـاخود لـە دەرەوەی تەسەووف گوزارشت و بابەتیان هەن؟!!.

بەر لەوەی بچینە نێو ئەم پرسیارانەوە، ئەم زاراوانە بۆخۆیان دەمێکە لە سروشتدا هەن، بەر لەوەی هۆشی مرۆڤ پەیان پێ ببات، بەڵام کاتێک کە بووە ڕێباز و ڕێگەیەکی گرنگ، بێگومان زۆر کاردانەوەی ئیجابی بەخۆوە دی و بووە قۆناغێکی کاریگەر لە مێژووی مرۆڤایەتی دا و ڕەگەزی پەرەسەندن و گەشەسەندن و شارستانی بەخۆوەدی، لەبەر ئەمانە چ (علم) و چ (عین) و چ (حق) و چ (یقین) چەقێکی دیاریکراویان هەیە، ئەم چەقەش لە هەر زانست و بوارێکدا بارێکی چەسپاو پێکدێنێ و ناکرێ لەوبارەدا جودا بکرێتەوە و لێ دوور بکەوێتەوە، بەڵام نیشان دانی بە چەندەها هونەرکاری و قوڵبوونەوە تیایدا کارێگە باری گوزارشتەکان فرەوانتر دەکات، جا ئەم زاراوانەش وە نەبێ هەموویان لە یەک کێڵگەدا بوونیان هەبێ، بگرە بۆ خۆیان چەندان کێڵگەیان داگیر کردووە و بەپێی مێژوو گەشەیان سەندووە و نەشونمایان کردووە، بەڵام ڕوانگە و دیدی هەر یەک لە گوزارشتەکان دەست نیشانی باری زاراوەکان بە گشتی و تایبەتی دەکا، ئەم سەرنجانەش بەر لە ئاماژە پێدان و خستنە ڕوویان گەلێ پێویستن.

(علم الیقین) و (عین الیقین) و (حق الیقین) پلەی باوەڕن لە جیهانی تەسەووفدا، بەواتا لە هەر یەکیاندا دەتوانین دەست نیشانی پلەی باوەڕ (ئیمان) تیایدا بکەین و لەم ڕوانگەوە پێناسی ئەو زانستە بکەین کە لێوەی چەمکی گرتووە، بەواتا پەڕینەوە لە چەمکێکەوە بۆ چەمکێکی تر، چونکە ئەم زاراوانە بۆخۆیان چەمکێکی فرەوانن، خاوەن یەکەی خۆیانن و گوزارشتەکانیان بە توندوتۆڵی دەپارێزن، لەلایەکی ترەوە ڕێڕەوی تەسەووف دەست

نیشان دەکەن کە لەنێوان هەر چەمکێکدا پردێکی مەعنەوی هاتۆتە ئاراوە کە بەهۆی تێکۆشان لەلایەك و بەهۆی بیر لێ کردنەوە لە ژێر ئەم سەقفەدا لەلایەکی تر دروست بووە، جا پێناساندنی ئەم ڕێڕەوە لە ناوەوەی تەسەووفدا ئاماژەی پێدراوە و بزافەکان لە ناوەوەدان، بەوپێیە لە دەرەوەدا ڕەنگدانەوەیان کەمتر دەبێ، لەلایەکی ترەوە ئەگەر پەل بۆ دەرەوە بهاوێین دەگەینە ئەو مەبەستە لە کوێدا جیاوازی چەمکەکان لەگەڵ زانستەکانی تردا دەکەوێتەوە!!!، بێگومان زانایان لەم چەمکانەیان بەر لە تەسەووفی ئیسلامی ڕاڤە کردووە، بەڵام خودی جیهانی تەسەووف ڕەهەندێکی تری پێ دەدات، کە پێناساندنی تایبەتمەندی بەرهەمدێنێ، لەم سەروبەندە دا ئەم جیاوازییانەمان بۆ دەردەکەوێ بە تایبەتی لەگەڵ خودی زانست(علم) و لەگەڵ خودی (فەلسەفە)دا، چونکە ئەم چەمکانە چەمکێکی گەلێ فرەوانیان هەیە، بەڵام لەلایەکەوە دەبێ بزانین تەسەووف لەمانەدا- لەم چەمکانەدا- لە قەوارەی مرۆڤ ناترازێ، بۆیە لە بزاڤێکی گیانی دەکاتەوە، بەم شێوەیە لایەنی دەرەکی دەست نیشان دەکرێ، کە لە کاتێکدا جیاوازی لەگەڵ زانستەکان و فەلسەفە دێتە ناوەوە دەکرێ ئەمەش لەهەمان مەبەستدا جۆرو شێوازو چەندێتی پلەکان و بەرزێتی- تەسەووف- مان بۆ دەربکەوێ، چونکە هەمووی ئەمانە بەیەکەوە بەستۆتەوە و یەکبوونێك کە لە زانستەکان و فەلسەفە ئەوەندە بە مەتینی هەرگیز دەست ناکەوێ، سەرەڕای ئەوەی بە کۆمەڵێ چەمکی تر دەورە دراوە و خزمەت دەکرێ، کە پێگە و مەرجی گرنگی بۆ دروست کردووە، لەلایەکی ترەوە ئەم یەکبوونەش خاڵێکی وەرچەرخان کە

تەسەووف بەهۆی کۆمەڵێ چەمکی تر ئەم ڕێڕەوی دروست کردووە و کاردانـەوەی بەسـەر قـەوارەی مرۆڤـەوە پابەنـدە، ئەمـەش ڕێـڕەوی گشتی دەست نیشان دەکا، بەو شێوەیە لـەم بارانـەدا (علـم الـيقين) و (عين اليقين)و (حـق الـيقين) هاتنوونەتـە کايـەوە، کـە پێگـە و مـەرجی تەسـەووف پێکـدێنن لـەو پلـەی بـاوەڕ لەلايـەك و ڕێـڕەوی نـاوخۆی تەسـەووف لەلايـەك و جيـاوازی چـەمکەکان لـە زانسـت و فەلسـەفە لەلايـەك و دواهـەمينيان دەورەدانـی بەکۆمـەڵێ چـەمك و يـەکبوونی وەك خاڵێکی وەرچەرخان لەلايەکی ترەوە.

لێـرەدا چـوار چـەمك بـە تـەنها هـەن (علـم) و (عـين) و (حـق) و (اليقين)، بەر لە هەر شتێ (يقين) هـەموويان بەيەکـەوە دەبەسـتێتەوە، لەبەر ئـەوە (علـم) و (عين) و (حـق) گوزارشـتن لەسـەنتەری گشـتی دا، کە چەقی گشـتی (يقين) کۆيـان دەکاتـەوە، و بۆخۆيـان هـەر سێکيان (علم) و(عين)و (حق) سەنتەری تايبەتی پێکدێنن.

لەمەوە بەر لەم سێ چەمکە دەبێت پێناسەی (يقين) بکەين، بەگشتی (يقين) چی يە؟!! لە جيهانی تەسەووفدا چی دەگەيەنێ؟!!

(يەقين) پێچەوانەی گومان (شك)ە، گومان وەك تەموژە، بە واتا خودی تەمومژ نيە، بەڵام لە تەمومژ و تەمتومان دەچێت، گومان وەك نابيناييە، گومان ڕوون نيە، لە دوای ئەوەی کە ڕوون نيە، نەزانين دەخاتە جەستە و قەوارەی مرۆڤ، گومان ئەو گۆڕەپانانەن هيچ شتێکی مرۆڤی نەگەيشتويەتی گومان نێوانی نێوانەکانە، ڕەنگە لە هەموو شوێن و زەمەنێکدا بەشێوازی جودا جودا هەبێت، بەڵام يەقين بەواتا دڵنيايی، بەواتا مەعريفەی پڕ و کامڵ و تەواو، لە قوڕئانی پيرۆزدا دەستەواژەی (يەقين) هاتووە، کە خودای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴾[1].

شێخی گەورە (محیی الدین بن عربی)(قدس الله سره) ئەم ئایەتە شەرح دەکا، پێی وایە قورئانی پیرۆز ئەم واتایە بە دەستەوە دەدات، کە -مولی- بەم هۆیەوە بەرز دەبێتەوە بۆ مەقاماتی بالاَ، لەمەوە گومان بەرزدەبێتەوە و پێداگرژان نامێنیٚ و (یقین) دیٚ، هەروەك خودای گەورە فەرموویە بە بەرزێتی ئەم شتانە، ئەمانەش قیامەتی بچووکە وەك نموونەییٚ بەحەق هێناویەوە لەمەدا بەختەوەی بۆ تۆ تێدایە و دەتپارێزیٚ یاخود کە رێت ون کرد دوای ئەوە کێشەت دێتە ریٚ"[2].

بەو پێیەی چەقی(یەقین) گشتی یە، بۆیە دەبیٚ لەم روانگەوە سەیری چەمك زاراوەکانی تریش بکەین، لەبەر ئەوەی مەبەستمان قەوارەی مرۆڤ و لە چوار چێوەی تەسەووفدا(یەقین) لەباوەڕ دەرناچێت، بۆیە (یەقین) گەر وجودی هەبێت، دەبیٚ دڵەکان پڕ بکا، کەواتە شوێنی لە دڵەکان نامێنیٚ نێوانی هەبێت، کە نێوانیش نەما، ئیدی هەمووی دەبێتە یەك قەوارە، یەك پارچە، لەبەر ئەوە بەهیچ جۆریٚ شتێك نامێنیٚ کە درزی بخاتە نێوانیانەوە، (یقین) دڵەکان پڕ دەکا لە رووناکی، هەمووی شتیٚ بێجگە لەمە بەرپەچ دەداتەوە و دڵەکان پڕ لە شوکوری خودا دەکا و پڕی دەکا لە ترس (خوف) لە خودای گەورە، بۆیە لێکۆڵەرانی تەسەووف بە قووڵی باسیان لە یەقین کردووە و هەموو لایەنەکانیان روون کردۆتەوە، جا لەسەرەتادا

---

1 – سورة الحجر، الآية ٩٩.

٢ – معجم الألفاظ الصوفية، د. حسن الشرقاوي، ص٢٨٩.

خودی پیاوان و ئەولیاکان لێ دواون، ئەمەش بەسەرچاوەی بنەڕەتی دادەنرێت، ئەمانە وا باسیان کردووە کە(یەقین) بەواتا گرنگی نەدان یاخود کەم گرنگدان بە بەیانی، بەواتا بەیانی لێرەدا خودی کەلێنێکە ماوەتەوە و بەیانی جێبەجێ دەبێ، چونکە ئەم کەلێنانە بۆ خۆیان کاتێ پڕ دەبنەوە، روونە کە بەهۆی ئارەزووەکانەوە پڕ دەبنەوە، بۆیە پڕ بوونەوەیان بۆ نیە هەروا لەم رووەوە (سهل بن عبدالله) دەڵێ: (یەقین لە زیاد بوونی ئیمانە و لە بەدەست هێنانیەتی)[1].

(یەقین) لە جیهانی تەسەووفدا بەشێکی زۆری وەرگرتووە، ئەگەر بۆ پێناساندنەکان بگەڕێینەوە گەلێ چەمك و پێناسەمان دەست دەکەوێ، ئەوەتا (ابوعبدالله بن خفیف) دەڵێ: (یەقین نهێنیەکان بەهۆی ئەحکامی موغیبات بەدەست دێنێ)[2].

(یەقین) پۆلێکە لە ئیمان، کە بەبێ (تصدیق) دێتە ئاراوە، هەروا دەڵێن یەقین زانستی عەمبارکراوە لە دڵەکان، ئەمەش لێرەدا دەست نیشان دەکرێ، ئایا چۆن عەمبار کراوە؟!! ئایا بەهۆی بە دەست هێنان، یاخود بەخشین لەلایەن خودای گەورەوە هەروا دەڵێن (یەقین) موکاشەفەیە، بەڵام زیاتر رێڕەو دەگرێ، بۆیە (محمد بن الحسین) دەڵێ: (هەندێکیان دەڵێن یەکەم مەقامات مەعریفەیە ئینجا یەقین، پاشان (التصدیق) ئینجا دڵسۆزی (إخلاص) ئینجا گەواهی پاشان تاعەت و ئیمان بەم ناوە ریزکراوە، هەمووی ئاماژە

---

١ – الرسالة القشيرية، ص١٤١.

٢ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤١.

بەوە دەدەن)[1]. بەم پێیە دەردەکەوێ کە واجباتەکان دوای ئەمەی زیاتر چوونە قولاییانەوە یەکەم باریان خۆی لە مەعریفە بەخودای خۆی دەدۆزێتەوە و هەرگیز مەعریفە دەست ناکەوێ ئەگەر مەرجەکانی پێشکەش نەکرێن، کە ئەمەش بە روانگەی راست و دروست دێتەکایەوە، ئینجا کە بەڵگەکان بەدەست کەوتن، بەرە بەرە لەم جیهانەدا تابش و نور و بەصیرەت دوای تێکۆشانی زۆر دێتە ناو دڵەکان و دەست دەکەوێ کە لەم قۆناغەدا دەگات بە (یەقین) ئەمەش چەمك و مەغزا و مەبەستی ئێمەیە، بۆیە گەورە پیاوان و ئەولیاکانی تەسەووف لە بابەت (یەقین) و (دڵ)ەوە دەڵێن، حەرامە بۆ دڵ کە بۆنی (یقین) بکا و تیایدا کەواتە دەبێ دڵ بۆنی یەقین بکا بەرە و خودای گەورە، (یەقین) دڵەکان دەکاتە موڵکی خۆی و تیایدا ئیمان بە تەواوی دەچەسپێ و بەهۆی (یەقین)ەوە خودای گەورە دەناسرێ، لەگەڵ هەموو ئەمانەشیدا (یەقین) پلەی بۆ دەست نیشانکراوە کە کۆمەڵێ چەمك و مەنزا لە خۆی دەگرێ، تیایدا هەموو بوارەکانی روون دەکاتەوە، بەگشتی (یەقین) پێچەوانەی گومان (شك)ە، ئەمەش هەرچۆنێك بێ تیایدا پلە پلەیی دەبێتە پێوەرێکی گرنگ، بەڵام لە تەسەووف گەلێ تایبەتمەندی هەن وابەستەن پێی کە جیهانێکی فرەوان دروست دەکات و کۆمەڵێ پەیوەندی دەنێتەوە، و بە مەحکەمی دروست بوو و چ جای ئەو رێڕەوە مەزنەی هەیەتی.

---

[1] – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤١.

لەبارێکی وا دا گەر بەو باسەدا بچین، بەواتا باس لە تەسەووف و یەقین بکەین، جۆرێ سەرەتا پێناسەکانی تەسەووف بکەین، پاشان لەگەڵ ئەو هێڵانە بدوێین، کە یەقین لەوناویان دا کێشاویەتی، ئەمە قورش دەکەوێتەوە، لەبەر ئەوە لۆژیکی هێڵە گشتی و تایبەتیەکان، یاخود چەق و کەنارەکان ریگەی باشترە و کۆمەڵێك تایبەتمەندی و خاسڵەتی چاکی هەن، لەم بارودۆخەدا بە روونی لەبابەت پێناسەی (یەقین)ەوە هەندێ هێڵمان دەست نیشان کرد، لەمەدا چوارینەیەك یاخود چوارلایەك دروست بوو، کە تیایدا ئەمانەن (یقین، علم، عین، حق) بەجودا هەریەکەیان پێناسەیەکیان هەن و بە زنجیرە (یەقین) لە هەموویان بەشدار دەبێ، لەوانە (یەقین) ژێرخانی ئەم هاوکێشە مەزنە پێکدێنێ کە ئەمانی تر باری بگۆڕن، بەلاّم هەریەکەیان خاوەن مەرج و پلەوپایە و قۆناغی خۆیانن، لەبابەت ناساندنی یەقینەوە (شیخ جنید) بە دوو وشە پێناسەی کردووە و گوتوویەتی: (بەرز بوونەوەی گومانە)[1].

هەروەها کەلێکی تر گوتوویانە (یەقین چاوی دڵە)[2]. لێرەدا دەبێ رەچاوی ئەو ئاستانە بکەین، کە پێناسەکانی تێدا هەن، چونکە کاتێ بە ناساندنێك دێتە پێشەوە، کە (یەقین) بەرزبوونەوەیە، ئەمە ئاراستەیەکی دەست نیشان دەکا، ئەم ئاراستەیەشی جێگیرە و ناگۆڕێت، نەگوتراوە کە نزم بوونەوە بێت، چونکە نزم بووەوە، ئامارژە دەدا بەو پانتاییەی کە تیایدا تا

---

١ – التعرف لمذهب اهل التصوف، ص٢٢.

٢ – هەمان سەرچاوەی پێشوو.

زیاتر نزم بێتەوە گومان سنووری فرەوان دەبێت، هەروەها کە (یەقین بە چاوی دڵ) پێناسە کراوە، لێرەدا سەرەڕای یەقین دەبێ چەمکی چاو و دڵ بزانین، هەروەها لەگەڵ ئەو پەیوەندییەی هەیانە، دیارە لێرەدا چاو، ئەرکی چاوی سادەیی نیە، بەڵکو ئەو چاوەیە کە دڵ هەیەتی، جا دەبێ چاوی دڵ چۆن بێت؟!!؟، بەواتا ئەو بینایییەی دڵ پێویستیەتی، دەبێ چ نهێنییەك بەو چاوە ببینێ، حەتمەن دەتوانین بڵێین لە ڕووی زەمەنەوە بەرز بوونەوەی گومان زووتر ڕوودەدا، پاشان ئەرکی چاو دروست دەبێت لەناو دڵدا، لێرەدا یەقین چاوی دڵە، دەبینێ، موشاهەدە دەکا، وەك چاوی تر، تەنها وەزیفەی وەرگرتووە، ئەم وەزیفەیەش ئەسڵە لە مەسەلەکاندا، ئەسڵە بۆ بینینی ڕاستەقینە.

هەروا (عبدالله) دەڵێ: (یەقین بە یەك گەیاندنی نێوانەکانە، لێك جودا بوونەوەی نێوانی نێوانەکانە). هەرچۆنێك بێت یەقین هەوڵ دەدا بۆ یەك قەوارە، ئەم خاسڵەتەشی تێدا بەدی دەکرێ، بێگومان لێرەدا مەبەستمان لە جیهانی تەسەووفدایە، ئەویش بە هەموو جۆرێ بەرەو یەکبوونی ئەو قەوارەیە دەچێ، لەمەشدا هەموو ڕووەکان دەبینێ و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، بۆئەوەی هەموو ڕێگەکان بگرێتە بەر کە خودای گەورە پێی خۆشە.

هەروا (النوری) دەڵێ: (یەقین، موشاهەدەیە)، (إبن عطاء) دەڵێ: (یەقین بەدرێژایی کات تاکو ئێستا لە دژایەتی دایە)[1]. کەواتە ڕووەکەی تریشی ڕاست دەبێت، بەجۆرێ دەبێ تێکۆشان و

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٣.

هەوڵدان لە ئارادا بێت، ئەگینا سنووری یەقین بەرەو کزبوونەوە دەچێت و تەسك تر دەبێت، ئەمەش تەواوی مەغزای تەسەووف دەست نیشان دەکات، لێرەدا پێویستە جۆری یەقینەکان دەست نیشان کەین، کە ئەمانیش هەریەکەیان بەزاراوەی خۆی دێتە پێشەوەو سێ قۆناغی لە خۆگرتووە، یەقین ئەگەر سەرەتاکەشی هەرچۆنێك بێت، ئەوا سنووری ئەسڵی و راستەقینەی لە دڵ دایە، کەواتە وەك دەوڵەتان کە پایتەختیان هەیە، وەك ناوەندی هەموو مەسەلەیەك سنووری تەواوی یەقین لە دڵ دایە، لەبەر ئەوە زانینی (یەقین) تیایدا سیفەتی رەهایی و دوا خاڵی هەیە، بە واتا سیفەتی تەواوێتی تێدایە، وەك ئەوە نیە بگەڕێتەوە بۆ دووبارەکردنەوە، لە زانستدا زانینەکان تەنها لەسەر چاو وەستاو دەبن، هێندە قووڵاییان نیە ئەوەتا (سهل) دەڵێ: (یەقین بەواتا موکاشەفە)یە[1]. لەمەوە روون دەبێتەوە هاوکات لەگەڵ هەوڵ و تێکۆشان یەقین رێ و رەسمی خۆی دەگرێ لەو پایەیەی ئیمان- باوەڕ هەیەتی، چونکە ئەولیا و پیاوچاکان گوتویانە ئەگەر پەردە بدۆزرێتەوە- مەبەستی لابچێ- لەسەر دڵ دا ئەو یەقین زیاد ناکات، لێرەدا ئەوە روون دەبێتەوە کە یەقین تەنها جارێك دەگات بە پلەی رەهایی و تەواوێتی لەمەوە سنووری هەیە، کە تەواو دەگا، لەلایەکی ترەوە بۆ خۆی یەقینی پەیداکردووە، دەبێ لەو هەموو بارەدا پێویستی پێ هەبێ جەختی لەسەر بکرێتەوە، ئەمەش ئەوە دەردەخا قۆناغەکان هەموویان لەیەك زنجیرەدان و یەکتری تەواو دەکەن.

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو.

شێخ (جنیدی بەغدادی) دەڵێ: (یەقین ئارامبوونی زانستە، کە هەڵناگیردرێ و تەحویل ناکا و ناگۆڕێ)[1]. کەواتە یەقین جیهانێکە دوور لەمانە، رەنگبێ ئەمانە لە دەرەوەی گومانیش دا هەبن، بەلأم بەلای (جنید)ەوە تەنها (دژی گومان) کافی نیە بۆ ئەوەی تەواوی یەقین بناسین، بەڵکو یەقین ئارام بوون لە خۆ دەگرێ و تیایدا گۆڕانکاری روونادا، مەغزای ئەمە لە فرەوانیەتیەوە دەست پێ دەکا، چونکە دەشێ دوور لە گومان گۆڕانکاری روویدا، یا تەحویل یاخود هەڵگیران، هەروەها دەشێ بەهۆی گومانەوە ئەمانە روویدەن، لەبەر ئەوە بوونی یەقین لەم بارەوە بە مەغزای فرەوان دەورەدراوە و بەرەو خودای گەورە دەچێ.

یەقین بەهۆی (مکاشفة) لەوەدایە کە بەدەردەکەوێ بە زیکرەوە خۆی نیشان دەدا و پێش دەکەوێ تاکو دەگات بە چەسپاندن، ئەمەش راستەقینەیی ئیمان بەدەردەخا، کە یەقین تەنها لەنێو ئەم چوارینەدا (الیقین، علم، عین، حق)دا ناوەستێن، بگرە بەرەو مەزنێتی ئەو پەیوەندییانە دەچین لە گەردووندا کە دیار دەکان، مەسەلەکان هەیانە، ئەمەش دیارە لە بابەتی تەسەووف ناوەندێکی گەورە پێکدێنێ، ئەوەتا لەم هاوکێشەیە بۆمان دەرکەون رۆڵی (مکاشفة) کە لە چ کاتێکدایە لە تێکۆشانی تەسەووف دەردەکەوێ، هەروەها چەندان زاراوە و حاڵ و مەسەلەی تر لەم نێوەندەدا یەکانگیر دەبنەوە و بەرەویەك ئامانج دەچن ئەویش لە پێناو خودای گەورەدا.

---

[1] – الرسالة القشيرية، ص١٤٢.

شێخ (ابوبکر الوراق) دەڵێ: (یەقین موڵکداری دڵە، و بە ئەوەوە ئیمان کەماڵ دەبێ و بە یەقینەوە خودای گەورە دەناسرێ و بە عەقڵیش عەقڵ لەبارەی خودای گەورە)[1].

لێرەدا پلەی یەقین دەناسینەوە بەجۆرێ تیایدا بە تەواوی دەسەڵاتی بەسەر دڵدا بشکێ، ئەمە لە تێکۆشان و ئاراستەیەك دەستی پێکردووە، بەواتا لەخۆوە بۆیەك نەهاتوون، مەگەر دەبێ لەوێدا یەقین بدۆزرێتەوە و لەوێدا تەواوی دەسەڵاتی کار پێ بکا، ئەمەش جیهانێکی خاوەن ئیرادە و پاشان بەرەو دوورتر لەو ئیرادەیە و بینین دەست پێ دەکا، چونکە کەماڵ بوونی ئیمان بۆ هەموو، سەراپا تاکەکان نەهاتووە، لێرەدا رووبەرووی گرفتی ئەوە دەبینەوە کە حەتمەن جیاوازی هەیە لە نێوان ئیمانی تاکەکان لە کۆمەڵگادا لە سنووری شەریعەتدا، کەواتە مەبەستمان ناو جیهانی ئیمانە، دیاریشە لەسێ لاوە بەم پێناسەیە وەسف کراوە و ئاماژە پێدراوە، ئەویش لەنێوان (دڵ و ئیمان و ناسین)دایە، ئەمەش هەریەکەیان رێڕەوێکی لە جیهان و زانستی تەسەووف داگیرکردووە.

هەروا گوتراوە کە (ئەگەر عەبد راستیەکانی یەقین تەواو بکا، ئەوا بەلا لەلای دەبێتە نیعمەت و رەخاء دەبێتە موسیبەت)[2]. یەقین لەناو خودی راستیەکان دا بەدەست دەکەوێ و لە دەرەوەی ئەمەدا مایە پووچ دەردەچێ و هیچ ئەرزش و بەهایەکی نابێت، جا لەمەوە بوونی یەقین کار لە هەڵوێستەکان دەکا و ئەوەی دێتە رێگا بەرەو حاڵەتێکی

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٣.

٢ – الرسالة القشيرية، ص١٤٣.

دیکەی دەبا ئەوەتا بەڵا دەبیٚ بە نیعمەت، مەبەست لەمەدا ئەوەیە ئیرادەکان لە دەرەوەی مرۆڤ دا راستە مرۆڤ یەقینی هەیە، بەڵام لە ژێر سێبەری خودای گەورەدا چرۆ دەکا و ناواخنەکانیش لەلای ئەودا دەدرێن، ئەگەرنا جیهان چ مانایەکی هەیە؟!!!.

بەگشتی لەبابەت پێناسەی خودی(یەقین) دا، ئەوەمان لا دەرکەوت کە لە چ ئاستێك دایە، چ روانگەیەکی هەیە، بۆچی تێکۆشان و هەوڵدانێك دێتەکایەوە، لێرەوە دەبیٚ لەم زنجیرە واتا چوارینەدا (الیقین، علم، عین، حق)دا هەر هەمووومان بناسین، پاشان بەراوردێکی ووردیان بکەین، لەبەر ئەوە یەقین زۆربەی بوارەکە پێکدێنیٚ بۆیە بە کونو کەلەبەرەکانی دا چووین، لێرەشەوە روو دەکەینە (عیلم) چ لە دەرەوەی زانستی تەسەووف و چ روانگەی ئەولیا و پیاوچاکان و ئەوەندە کاری بەسەر قەوارەی مرۆڤ دا هەیە، لەبەر ئەوە هەڵوەستە لەسەر پێناساندنی ئەمانە دەکەین، بۆئەوەی لەناو خۆیان دا بیانناسین، پاشان پەیوەندی نێوانیان پاشان پەیوەندی هەموویان لە هاوکێشەیەکدا بخەینە روو بۆ ئەوەی لەمەزنێتی زانستی تەسەووف بگەین، کە ئەم دەرەنجامە گەورانەی لیٚ کەوتۆتەوە.

زانست بەگشتی گەلیٚ واتای لە خۆ گرتووە، لێرەدا مەبەستمان لە (علم)ە، چونکە پێناسێك دەدا بە زاراوەکانی تر، لەبەر ئەوە (علم) واتاکانی لە زۆر ئاستدان، وەك روونە ئەم واتایانە هێڵی ئاسۆیی و ستوونیان هەیە، واتای زانست – علم– لە بازنەی هەستدا، ئەوەتا دەڵێی (شتەکەم زانی) یا (شتکەم ناسی) ئەم واتا ساکارە دەزانین کە بازنەی هەستە، بەواتا نیشانەکانیم ناسی و لە

یەکەم جودا کردنەوە، لەبەر ئەوە دژی (علم) ئەوا (نەزانینە)، لە (علم)یش دا فرمانی رەها نیە، بە واتا ناتوانین بە تەواوی بیچەسپێنین و بەتەواوی رەتی کەینەوە.

بەلای سۆفیەکان و زانستی تەسەووفەوە (علم) بریتی یە لە دوو جۆری (علم) یەکەمیان (کەسبی) بەدەست هاتوو، ئەویش لە رێی هەوڵ و تێکۆشان و ماندوو بوون، بەدەست دێ، دووەمیان (علم وهبی)یە بە واتا پێی بەخشراوە، کە بەهۆی ئەم (علم) وەرگیراوە ئەسڵ و بەشیان لێك دەناسرێنەوە، (علم وهبی) ئەوەیە کە خودای گەورە دەیهاوێتە دڵ و دەبێتە زانست بەواتا (علم) و لەهەمان کاتدا دەبێتە زانا (عالم) و لە هەمان کاتدا دەبێت بە زانراو (معلوم) کەواتە (علم وهبی) لە ئاستێکی بەرز و فرەوان دایە، ئەویش بەلایانەوە بە(مەعریفە) ناو دەبرێت، چونکە ناوسینەوەی شتەکان لەیەك بازنەدا تێکەڵ بوون و یەکتری نیشان دەدەن، لەمەوە زانایان و گەورە پیاوانی تەسەووف دەڵێن زانست مەعریفە و مەعریفەش زانستە و هەموو کەسێکی کە عالیم بێ بەخودای گەورە ئەوا عارفە و هەروا هەموو عالمێك عارفە، ئەوەتا لە بابەت مەعریفەوە ئەو سیفەتە ناسراوە کە ناسینی بە ناو و سیفەتەکانی خودای گەورە هەبێ ئینجا خودای گەورە لە مامەڵە کردنی دا بڕوای پێ بکا و پاشان ئاکارە ناپەسەندەکانی بسڕێتەوە بە هەمیشەیی[1]. پاشان بەرەو ئەم دونیایە هەنگاو بنێ، بەمەوە (علم وهبی) پێی دەبەخشرێ، لەبەر ئەوە مەعریفە بەخودای گەورە بەدەست هێنانی بەخشینە لە خودای

---

[1] – الرسالة القشيرية، ص٢٤٢.

گەورەوە، ئەوەی مەعریفە زیاد بکا شان و شکۆی زیاتر دەبیّ، چونکە مەعریفە ئارامی بە دلّ و ناوەوە دەبەخشیّ لەبەر ئەوە چەند مەعریفە زیاتر بیّ، هیّندە ئارامی زیاتر دەبیّ.

عیلمی بەدەستهاتوو لە ریّگەی گەیشتن بە مەعریفەیەك دەبیّ کە بەهۆی عەقلّەوە دیّتە ئاراوە، بەواتا مەعریفەیەك یاخود زانستیّك بەهۆیەوە دەگەین بە شەریعەت و دەتوانین حوکمی پیّ بدەین بۆ ئەوەی لایەنەکان جودا بکەینەوە، لە ژیّر سیّبەری شەریعەت، پیّویستە بۆ جوداکردنەوەی حەلاّلّ و حەرام، یاخود بۆ فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە کردن، بەلاّم (علم الوهبی) کە ناودەبریّت بە (اللدنی) لەناو خۆیدا دابەش دەکریّت و دەبیّت بە پلە کە ئەم پلانەش ئاماژە جۆر و نیشانەکان دەکەن، لەبەر ئەوە یا دەبیّ سروش- وحی- بیّت، کە تەنها ئاماژە بە پیّغەمبەران دەکات و تایبەتە بەوان یاخود دەبیّت بەهرە- إلهام- بیّت و ئاماژە بکات بە پیّغەمبەران و ئەولیاکان، ئەویش لە قورئاندا هاتووە، ئەوەتا خودای گەورە دەفەرموویّ: ﴿ نَحۡنُ نَعۡلَمُهُمۡۚ ﴾[1]، هەروەها دەفەرموویّ: ﴿ وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ ﴾[2]، لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە سەرچاوەی ئەسلّی (علم) لە کویّدایە؟!!

راستە مرۆڤ بیرکردنەوەی هەیە و هەولّ دەدات دەوروبەری کۆنترۆلّ بکات و بەرەو پیّشکەوتن بڕوا، بەلاّم ئایا چ دەسەلاّتیّك ئەمەی پیّ بەخشیوە؟! لیّرەدا دەگەینە ئەوەی کە خودای گەورە ئەم

---

١ – سورة التوبة، الآية ١٠١.

٢ – سورة العنكبوت، الآية ٤٣.

دەسەلاتەی پێ بەخشیوە، جا گەر زیاتر بگەڕێین، دەتوانین بەدوای ئەو زانستەوە بین کە تیایدا خودای گەورە داویەتی، هەروەها دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ ﴾[1]، یا دەفەرمووێ: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ ﴾[2]، یاخود لە فەرموودەی پێغەمبەر یوسف(ﷺ) ﴿ عَلَّمَنِي رَبِّيٓ ﴾[3]، یاخود دەفەرمووێ: ﴿ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ﴾[4]، یا ئەوەتا دەفەرمووێ: ﴿ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓاْ ﴾[5]، لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بە زانست کراوە بە هەموو جۆرەکانیەوە، بەتایبەتی ئەو دوو بەشە سەرەکیە، کە یەکێکیان پابەندە بە بیرکردنەوە و ئەزموونی مرۆڤ ئەوی تریان پابەندە بە بەخشین لەلایەن خودای گەورەوە، بەخشین لەناوەوەدا لە دڵ و دەروونـدا ئەمەش پێویستی بەوەیە، بەتەواوی پەیوەندی لەگەڵ خودا ببەستی و پشت لە کۆمەڵگا و پشت لە ئارەزووەکان و پشت لە دونیا بکەی، چونکە ئەمانە مرۆڤ لە زانستی بەخشین دوور دەکەنەوە.

---

١ – سورة فاطر، الآية ٢٨.

٢ – سورة البقرة، الآية، ٣١.

٣ – سورة يوسف، الآية ٣٧.

٤ – سورة يوسف، الآية ٦.

٥ – سورة الأنعام، الآية ٩١.

لەبەر ئەوە زانیاری راست و دروست بەوە ئەڵێن کەدان بنێت بە سنورداری زانیاری دا، وە بزانێت کە ئاوەز -عەقڵ- وە "عیلم سنورێکی هەیە، وە نابێ لە بەرەی خۆی زیاتر پێ راکێشێت" کەواتە سنوری ئاوەز وە زانیاری ناتوانێ لە چوارچێوەی "تاقی کردنەوەی ماددەیی" بترازێت، وە هەرچی کە لە سنوری رواڵەتی ماددە تاقی بکردنەوە دەرچو ئیتر لە وزەی زانیاری و ئاوەز بەدەرە[1]، لەمەوە دەزانین سەرچاوەکان جودان، بگرە زانستەکان دوو سەرچاوەیان هەیە، سەرچاوەیەکیان لەوە دایە، کە سەرچاوەی سەرچاوەکانە، ئەویش زانستی بەخشین- علم الوهبي- یە، ئەویش تریش سەرچاوەیەکە لەناوخۆدایە، واتە بەهەوڵ و کۆششی جەستەی مرۆڤ، بەهۆی یەکێك لە ئەندامە بەرز و ئاڵۆزەکان دێتەکایەوە، پەیڕوی یەکەم ئەزمونێکە، هێندە بڕ ناکا بە مەسەلە یەکلا کراوەکان، بەڵکو لە سنورێکی تایبەتی دا گوزەر دەکا، چونکە ئەتوانین بڵێین- عیلم- بەو واتایەی کە سنوری دیاریکراوە، لە وزە، لە مادە، لەکاروباری پێنج هەست کەرەکان، لە دەوروبەر و گۆڕینیان بۆ هێز لە پێشکەوتن بەسەر ئەوی تردا دەکۆڵێتەوە، کەواتە ئەزموونەکانی بە پێی رێبازێکە لە سنووری خۆیدا دەکرێ، لەم رووەوە چەندان تیۆری لێ دێتە کایەوە، بەلاّم ئەزموونی زانستی بەخشین- العلم الوهبي- کە لێرەدا ئێمە مەبەستمانە ئەزموونێکی روحی یە، تاقیکردنەوەیەکی رەوانی یە، کاری بە ماددەوە نیە، سنورەکان دەبڕێ و تێدەکۆشی بۆ ئەو

---

[1] - تەسەووف چی یە ؟ ل٦٤.

دیـوی مـادە، ئەمـەش خـودی تەسـەووف بـەدوای سەرچـاوەی سەرچاوەکانە، گۆڕەپانی زانستی بەدەستهاتوو- علم الکسبي- لە پێنـاو مەسـەلەیەکی کـاتی دایـە، بـەڵام گۆڕەپـانی گەردشـی تەسـەووف وا لـە کـەون و زەوق و رۆح و هەسـتی دەرونـی و ئیشراقی نوری خوداییدا وە بەرزتر ئەفڕێت[1].

لەبەر ئەوەیە کەلتوری تەسەووف گەڵ جیاوازی لە نێوان ئەم دوو زانسـتە هەیـە، بـۆ هـەموو ئەمانـە دەردەکـەوێ کـە بـاوەڕ بـە بـوونی خـودای گـەورە مـەرجێکی سـەرەکی یـە ئـەوەتا لـە بابـەتی زانسـتی بەدەستهاتوو، شـتی وا هاتۆتـە دی، بەجارێ مرۆڤایـەتی بـە تـەواوی بەرەو کاولکاری دەبەن، باوەڕ بوون بە ئیسلام تەواوی واتای پاکێتی دەگرێتەوە و خزمەت بە سەراپا کۆمەڵگا دەکات و لەباری تایبـەتی دا، کاتی تەسەووف ئەوڕۆڵە دەگێڕێ بێگومان جیهانی دوو دڵی و ناپەسەندی دوور دەکەوێتەوە، دەرگای رووناکی و تاو دەکرێتەوە.

دوای دەرکەوتنی جۆر و مەبەسـتەکانی زانسـت، ئەوەی لێرەدا دەبـێ روونـی بکەینـەوە کـە مەبەسـتمان لـە زانسـت بـەجۆری بەخشین، چونکە رێگای تەسەووف دەیەوێ مامەڵە لەگەڵ دەروون و قۆناغـەکانی بـەرەو خـودای گـەورە بکـات، لەمـەوە تـەنها جیهـانی پەسەندی دەبینێ و لای دەبێتە گشت جیهـان و بەسـەر بەدییـەکان و ناپاکەکان زاڵ دەبێت، کەواتـە زانستی بەخشین بـەرزین (یـەقین) لـەناو دڵـی مـرۆڤ دروسـت دەکـات بـەهۆی ئـەزموونی روحـی یـەوە، لەبـەر ئـەوە لـەناو ئـەو بازنـەی کـە یـەقین دروسـت دەکـەن و دژ بـە

---

[1] – هەمان سەرچاوەی پێشوو.

گومانن و له کاتێکدا چەندان قۆناغیان بڕیوە، بێگومان بۆخۆیان بەهۆی زانستی بەخشین-علم الوهبي-یەوە هاتوونەتە ئارا.

هەر چۆنێك بێت دەرگاکان وەك زنجیرە وان، بەبێ-علم الوهبي-زەحمەتە دەرگاکانی دیکە بکرێتەوە، چونکە هیچ دەرگایەکی تر نیە بۆ قۆناغەکانی تر، بێجگە لە-علم الوهبي- کە خودای گەورە بە تاقیکردنەوەی ڕەوانی پلە پلە سەری دەخا تاکو دەگا بە پلەیەکی باڵا و بەرز، لەمەدا هەموو ڕەگەزەکان، هەموو مەبەستەکان هەرچی هەیە بەرەو یەك قەوارە دەچی، مرۆڤ هێندە تێکەڵی ڕوح دەبێت، هەموویان لەبیر دەچێتەوە، بەجۆری تەنها پاکێتی و دەسەڵاتەکەی دەمێنێتەوە، لەمەوەبەرەوە یەك قەوارە، یەك ڕەگەز، یەك مەبەست دەچین، هەتا لە نێو هەموو یەکەکان دا بەرەو یەك دەچین و بەهای قەوارە و ڕەگەز و مەبەست نامێنێ تەنها و تەنها یەك دەمێنێتەوە، ئەم زنجیرانەش سەرەتاکەی و دەرگای یەکەمی زانستی بەخشین-علم الوهبی-ە، لەبەر ئەوە بەسەر یەقیندا کاریگەری دەبێت و گوزارشتی لێ دەکات، گوزارشتێك ئەو قۆناغە پێکدێنێ، ئەمە لە بارێکدا تەنها باس لە -علم- کراوە، بەڵام گەر بزانین بۆخۆی لەگەڵ -یقین-دا وەك لەمەوبەر پێناسمان کرد، ئەوا بە گوزارشتێکی فرەوانەوە دێتە ئاراوە، بۆیە لە-علم الیقین- ئاسۆیێك پێکدێنێ، بەڵام ئەم ئاستە لە نێو خۆیدا هەموو ئەو یەکانەی هەڵگرتووە تاکو بەرە و ئاستێکی تر بڕوا و ئەمەش ڕێڕەوێکی حەتمەیی یە، و دەبێت ڕووبدا، ئەگەرنا هیچ بەهایەك دروست نابێت، لەمەوە دەبێ بەدوای پێناسێك بگەڕێین کە لەنێوان (علم والیقین) هاتۆتە ئاراوە لە ساتێکدا زانستەکان

بەخشراون بە دڵ، و لە هەمان کاتدا گۆڕەپانی دڵ بەرەو خاوێن کرنەوە دەچێ لە گومان و نەمانی بۆشاییەکان.

دوای ئەمە قۆناغی تر دەست پێ دەکا کە تەواو بارگاوی کراوە، ئەویش (عین الیقین)ە، وەك ئەوەی پێشوو باس کرا، واتاکان هەمان ئەو واتایانە نین بە سادەیی باسیان لێوە بکرێ، بەڵکو گوزارشت لە مەسەلە رۆحییەکان دەکەن، ئەوەی لێرەدا رووبەرووی دەبینەوە و جیاوازی لەگەڵ-علم الیقین-دا هەیە، ئەویش ئەوە پەیوەندی عەقڵ بەناوەوە لەمەودوا دەپچڕێ، بەڵکو بۆخۆی لە نێو مەسەلەکان دایە، لەمەوە ئەم پرسیارە دێتە کایەوە، ئایا عەقڵی خۆمان ئێمەی پێ دروست دەکرێ؟! لەمەوە دەسەڵاتی عەقڵ دەبینی و باڵادەستی (عین الیقین) و قۆناغی دواتر دەردەکەوێ بەرەو خودای مەزن، رێگای تەسەووف لەمانەوە دەست پێ دەکا، زانیارییەکان کامڵ بوون لەگەڵ یەقیندا، ئایا ئەمە بەسە؟!! بێگومان نەخێر، چونکە -علم- لەم بارەدا (بەم زانینە ئەوترێ، تێگەیشتن لە رێگەی ئاوەزەوە پەی بردن بەوەی کە هەڵسوڕێنەر و دروسکەرێك هەیە لە ریگەی مێشك و لێکدانەوەی ئاوەزەوە)[1]، بەڵام بەدڵ و بەگیان بگەینە باوەڕی راستەقینە ئەمە لە سنوری -علم- جودایە، خۆت ئەو ببینی کە قۆناغێك بڕیوە لە قیندا، ئەمەش قۆناغی ناوەڕاستە، چونکە هێڵی باوەڕ لێرەدا کە دەکشێ بەهێزتر دەبێت، تاکو بەگیان و بە دڵ بگەینە باوەڕی راستەقینەوە خۆت بیچێژی وە بە گیان تامی

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ل٥٦.

بکەی، وە (إطمئنان) دڵنیایی دەروونی بەدەست بێریت، وە ئەم بە دەست هێنانی باوەڕی تەواوە بە خودا، بۆیە لەم ڕێگایەوە دەست ئەدات، چونکە خودا خۆی ئەیەوێ، چونکە بەگرتنەبەری ئەو ڕێگە تایبەتە، ڕێگەی (مەعنەویات) مرۆڤ ئەوەندە پاك ئەبێتەوە ئەگاتە رادەییێك شیاوی ئەوە ئەبێت خوای گەورە لە ڕێگەی (موکاشەفە) کەشف و دەرخستن یان موشاهەدە، چاوپێکەوتن بەچاوی دەرون چاوی بەصیرەت، یان ئیشراق درەوشانەوەی نوری خوا لە دەروونا، باوەڕەکەی ببێتە باوەڕێکی (عین الیقین)[1]، لەمەوە پێناسەکانیش بەرەو ئەوە دەچن کە دوای بەرزبوونەوەی گومان، ئەوا (موشاهەدە) دێتەکایەوە لە ساتێکا باوەڕ و قۆناغی زۆری بڕیوە و بەهێز بووە، چونکە دەرگای زانیاریەکان لەچاوی ئاسایی تێپەڕی کردووە و بەرەو دڵ چوون، لەمەوە چوونی بەرەو دڵ، بەواتا زانیارییەکان تەنها لەناو دڵ دا بۆ -یەقین- دەگەڕێتەوە، هەروا یەقین کە گۆڕەپانی دڵ داگیر دەکا و خۆی دەبێ بەو گۆڕەپانە، ئەوا یەقین دەبێتە چاوی دڵ[2].

لێرەدا ڕووبەڕووی دوو زاراوەی تر دەبینەوە ئەویش (مكاشفة) و (مشاهدة)یە، هەرچۆنێك ئەمانە لە خودی-عین الیقین- گوزارشت لێکراون و لە هەمان کاتیشدا، سەربەخۆ هەن، بەڵام لەباری سەربەخۆیی دا، ئەویش بەپێی پایە و قۆناغ هەن، کە تیایدا سەرەتا (المحاضرة – ئامادەگی)یە و پاشان (مكاشفة) و لە

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٦ و ٥٥.

٢ – التعرف لمذهب اهل التصوف، ص١٢٣.

کۆتاییدا (مشاهدة) دێت، دیاره له زۆر باردا گوزارشتەکان هەمان واتایان هەیه و دەکرێ کەمێ جیاوازی له نێوانیان هەبێت، یاخود بە هاو واتایی لای لێ بکرێتەوه، لەمەدا بابەتی (المحاضـرة) ئامادەگی دڵە و دەبێ ساز و ئامادەبێ، که دەبێ سەلماندنەکان لە ئارادابێ، بەڵام بۆ (مکاشـفة) وەك قۆنـاغ و پاشـان موشـاهەده (المشـاهده) دیـاره لـه موکاشـەفه (المکاشـفة) دڵ ئـەوەی بـۆ دۆزراوەتەوه که چی هەقه!!!، پێویست به سەلماندن نیه، تیایدا رابمێنێ، بەڵام (مشاهدة) که ئێمه لەگەڵ موکاشەفه پێویستیمان پێیەتی، ئـەوەتا قۆنـاغێکی بڕیـوه، لـه پێنـاو ئـەوەی شـوێنی گۆڕەپانی دڵ به تەواوی روو لەوه بکا که-عین الیقین- پێی داوه، لەمەوه پلەی بەرز دێته ئاراوه که له رێگەی بینایی دڵ، له رێگەی بەصیرەتدا شتەکان پێی دەگا، لەم قۆناغەدا فەرمانەکان جودا ناکرێنەوه، له موشاهەدەدا به تەواوی گومان روو لە هەڵدێر دەکا و شوێنەواری نـامێنێ، نـەك هـەر ئەمـه بـەڵکو بـوونی لـه دڵ دا دەسڕێتەوه لەمـەوه یەکـەم موشـاهەده یـەقین زیـاد دەکـا، خـودی یەقین فرەوان دەبێ و دەکشێ، ئەمەش بەدوای ئەو دیوی پەرده دەبێـت کـه بـۆی (کەشـف) دەبێـت، جـا ئەگـەر بـەهۆی سـوڵتان زیکـرەوه بەدەسـتی هێنـا دوای موکاشـەفه بـەرەو قۆنـاغی بـەرزتر دەچـێت کـه تیایـدا، -عـین الـیقین- بـه یەکـەوه دەبەسـتێتەوه و یەکەیەکی گەورەی لێ دروست دەکا و به تەواوی قۆناغه دەکشێ.

دەبێ بزانین دروست بوونی بەصیرەت، بەمانای چاوی دڵ هێندە ئاسان نیە، تێکۆشان و هەوڵی رۆحی دەوێ کە دەبێت، بوونی هەق دوای قۆناغەکان بەبێ تاریکی هەبێ و دەبێ لە سەکۆ و لوتکەیدا بدەروشێتەوە، کەواتە بوونی هەق لەگەڵ ون بوونی ساحێبی ئامادەگی –المحاضرة– بە ئایەتەکان پابەندە، هەروەها خاوەنی موکاشەفە دڵخۆشە بە سیفاتەکان، هەروا خاوەنی موشاهەدە مەعریفەکەی دەیسرێتەوە[1]، لەمەوە دڵ و دەروون پر دەبێ لە نوور و دروشانەوە بۆ ئەوەی بگات بە موشاهەدە و لەگەڵ هەق دا رەگەزەکان، مەبەستەکان، قەوارەکان بە یەک ببینێ بەچاوی دڵ –بەصیرەت– لەمەوە دەبێ نوری بالاّ و درەوشانە و ئیشراق تەواوی دڵی بگرێ، بەبێ ئەوەی ساتێك پەردە پۆش بێ و هیچ دابرانێك هەبێت، بەجۆرێ نەك تەنها لە شەودا ئەمە لە ئارادابێ، بەڵکو لەبەرۆژیش بێتەکایەوە تەواوی قەوارەی بگرێتەوە، کەواتە درەوشانەوە و نور شەو و رۆژی بەیەکەوە ببەستێتەوە، بەواتا بە رۆژ درەوشانەوە و ئیشراق تیشکەکانی خۆر خەرق بکا، ئەمە چ مەزنێتی بەرزییێکە، کە دڵ تیایدا یەقین هێندە سەربکا، و بە تەواوی هەمووساتەکان درەوشانەوە هەبێ بەبێ پچران کەواتە چەشتنی رەهاو پر دێتە ئاراوە و بە هەموو ساتەکان گوزەر دەکا، لە قۆناغێکدایە، یەکبوونی بەصیرەت و یەقین کاریگەری مەزنی هەبووە، کە کاتێ لە تیشکی خۆردا و بە رۆژ گوزەر دەکا، هەروا لە دڵ دا بە تەواوی چەشەی راستەقینە دەبەخشێ، لەمەوە ئەوەیان هۆنیوەتەوە:

---

١ – الرسالة القشيرية، ص٦٧.

ليلى بوجهك مشرق وظلامه فى الناس ساري
والناس في سدف الظلا م ونحن في ضوء النهار[1]

ئەوەتا شاتەکان چلۆن دیارن لە بابەت درەوشانەوە، کە شەوان بەڕووی دا ڕووناکەو تاوی تەواو نابێ و ڕاستەقینەیە، کەچی تاریکی بەسەر خەڵکیدا دەڕوا و دەکشێ، هەروا بەڕۆژی ڕووناکیشدا خەڵکی لە تاریکی دا نقوم بوون، چونکە تاریکی شەو مادی یە و تاریکی ڕۆژ بارێکی مەعنەوی وەردەگرێت.

بەم شێوەیە باوەڕ لە ڕێگەی قوڵایی یە لە ناوەوەی مرۆڤ دادەمەزرێ و بەدوای ڕاستەقینە دەگەڕێ و پاشان بەچاوی دڵ – بەصیرەت – دەیدۆزێتەوە، باوەڕ (لە ڕێگەی هەستی دەروونی یەوە، هەروەکو وتمان دێنو چەشتنی دەروونی، واتە لە موشاهەدە زەوق کە بەرهەمی "ئیشراق" واتە تابشی نوری خوداوەندییە، کە ئەم جۆرە باوڕە، هەروەکو وتمان باوەڕی ڕێڕەوی تەسەووفە)[2].

ئەو ڕێڕەوەی گوزارشتەکانی بە پتەوی دروست کردووە، لەمەوە بەهۆی بەصیرەت، و هەروا موشاهەدەوە، ئیتر (ئیمانی شهودی) دروست دەبێ، چونکە بۆ خۆی ئیمانی تەقلیدی لە کۆمەڵگا بوونی هەیە، ئەمانەش ئەو موسڵمانانەنین کە ڕێڕەوی سۆفیەتی یان گرتبێتە بەر، (ئیمانی تەقلیدی) زیاتر بەبێ عورف و داب و نەریت دەست پێ دەکا و پاشان دەچێتە قووڵایی ئیمانەوە،

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٨.

٢ – تەسەووف چی یە ؟ ل٦٩ – ٧٠.

بـەڵام عـورف هــەروەك هێڵـی گشـتی دەمێنێتــەوە، بـەڵام ئیمـانی ئیسـتدلالی لـە ڕێگـەی ئـاوەزەو بـەهۆی پێـنج هەسـتەکانەوەیە کـە دەبێ پەیڕەوی بکا لە شەریعەت بەڕێگەی -ظاهیر-ی، لەبەر ئەوە پـەیڕەوی کردنـە لـە شـەرع بەشـێوەی -دەرەکـی- بـەڵام ئیمـانی شهودی لـە قوڵایی دەروونـەوە ساز دەبێ و دادەمـەزرێ و بـەهۆی بەصیرەت لە ڕێگەی یەقین گۆڕەپان لەناو دڵدا دروست دەکا، لەبەر ئەوە ئەم باوەڕە دێنن و مەزەکردنی ناخ و دەروونە، لەمەوە بەهۆی پەیڕەوکردنی لە شەریعەت بە ڕێگـەی -باطن- دا دەنرێت، بەواتا حەقیقەتی پەیڕەو کردن لـە ئاینی ئیسلام دا لـە ڕێگـەی تەریقـەت، بۆ گەیشـتن بـە حەقیقـەت بـەو پێیـەی موشاهەدە بارێکی گـرنگ و کاریگـەر لـە-عـین الـیقین- دروسـت دەکـا، گـەڵ لـە ئـەولیاکان و پیاوانی تەسـەووف موشـاهەدە بەرامبـەر (عین) دادەنێن، کە دوای دڵنیـایی دێتــە کایــەوە و لــە پێنــاو تــابش و نــوری خوداوەنــد تێدەکۆشــێ، لەمــەوە (بێگومـان بنــەڕەتی بـاوەڕ لــە تەســەووفی ئیسلامیدا ئایینی (ئیسلامە) باوەڕ کردن بەتاکو تەنیای خود، "بە یەکتاپەرسـتی - توحیـد") بـاوەڕ بـە "ریسـالەت" واتـە بـە پـەیام هـاوردنی پەیامبـەر لـەلای خـوداوە، ئـەنجام دانـی فـەرزەکان بـە ڕێکــوپێکی، وە دەرنەچــوون لـــە چوارچــێوەی "شـــەریعەت"، وەلانــەدان لــە ڕێــڕەوی مەردایــەتی و پیــاوەتی و پیاوچـاکی، وە هەموو ڕەوشتێکی پەسەند، وە بە کورتی بە "ڤاهر وباگن" واتە بە ئاشـکرا و بـەنهێنی، پـەیڕەوی کـردن لـە دەسـتوراتی قوڕئـان وە پەیامبـەر، لەلایـەنی مرۆڤـە هـەرە گـەورەکانی ڕێـڕەوی تەسـەووف بۆمانی دەرئەخەن کە تەسەووف ڕێڕەوێکی ڕاستەقینەی ئیسلامە،

بەلاّم نەك هەر بە روالّەت وە "ڤاهر" بەلّكو لە كانگای دلّیشەوە، وە بە پەنامەكی، ئەویش بۆ نزیكبوونەوە لە خوا، هەروەكو وتمان بۆ گەیشتن بە پلەی (عین الیقین)، (حق الیقین) وە بۆ بەدیهیّنانی دەستووراتی قورئان... لەو ئایەتانەی بونەتە سەرچاوەی تەسەووف، هەروەكو پەیامبەر ئەفەرمویّ: (أَن تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَراهُ فَإِنْ لَمْ تَكُن تَراهُ فَإِنَّهُ يَراكَ)[1] واتە: ئیحسان بەوە ئەلّیّن: خوا جۆریّك بپەرستیت وەكو ئەوەی كە چاوت لیّیەتی ئەگەر تۆ چاوت لەو نیە ئەو چاوی لە تۆیە، جا بەمە ئەلّیّن مەقامی ئیحسان[2].

بەم جۆرە (عین الیقین) لە خودی زانستی تەسەووف بەگشتی سەرباری قۆناغیّكی نویّ، رەوشتیّكی نویّ پیّكدیّنیّ، چونكە لەوەدا لە دلّ دا هەروا لەباری باوەردا، هەروا لەگەلّ یەقین تەواوی مەغزاكانی خۆی دروست دەكاتەوە، ئەوەش وەك باسمان كرد بەو ریّگە گرتیە بەرە هاتۆتە كایەوە، لەو گۆرەپانە هاتۆتەكایەوە، كە گوزارشتەكان بە راستەقینەیی دروست بوونەتەوە دوای ئەوەی ئەم قۆناغە دەگاتە باری رەهایی و باوەری شهودی دروست دەكا، ئەوا پیّ دەنیّینە قۆناغیّكی تر، كە بەرزترین قۆناغە لەم بارەدا، ئەویش (حق الیقین)ە، بەلاّم بەر لەوەی باسی ئەم قۆناغە بكەین، و هیّلە گشتی یەكانی زیاتر بناسین، بەتایبەتی لەبارەی رەوشی (علم الیقین وعین الیقین وحق الیقین)دا، دەبیّ بە تەنها لایەك لە هەق -حق- بكەینەوە.

---

١ – صحيح البخاري، ر: ٥٠، كتاب الإيمان، باب سؤال جبريلَ النبي(ﷺ) عن الإيمان والإسلام والإحسان . صحيح مسلم، ر: ٩٩، كتاب الإيمان، باب الإسلام ما هو؟.

٢ – تەسەووف چی یە ؟ ل٦٠ – ٦١.

وەك گوتمان (عين اليقين) بەهۆی (بەصیرەت) لە (علم الوهبي) هاتۆتە دی، کە بەهۆی تێکۆشان و تێڕوانین بە دەست هاتووە، تیایدا (الأبصار) ڕۆڵی سەرەکی هەیە، زۆربەی پێشەوایانی تەسەووف پێیان وایە کە (عين اليقين) واتا (العلم اللدني) خۆیەتی یاخود، بریتی یە لە بەخشینی ئیلاهی و هەروەها (عين اليقين) لە قورئاندا بەهەمان واتا باسی لێوەکراوە، بەواتا خودی (عين اليقين) لە قورئانی پیرۆزەوە هەڵێنجراوە، خودای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ كَلَّا لَوۡ تَعۡلَمُونَ عِلۡمَ ٱلۡيَقِينِ ٥ لَتَرَوُنَّ ٱلۡجَحِيمَ ٦ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيۡنَ ٱلۡيَقِينِ ٧ ﴾[1].

هەق زۆر جار لە بەرامبەری دا هەقیقەت بەکاردێ، بگرە هاو واتای یەکن، ئەولیاکان و گەورە پیاوانی تەسەووف بەلایانەوە وشەی هەق مەبەست لەناوی خودای مەزنە، هەقیش بەهەموو ڕەوشەکان و بالاْ دەستی و مەبەستەکانیەو، ئەوەتا خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ ٢٥ ﴾[2]. هەروەها ئەمە بۆ هەق، بەلاّم هەرچی (حقوق)ە، بەواتا بەمانا کۆیەکەی و گوزارشتی -مافەکان- ئەوا واتای مەقامات و مەعاریف و ئیرادات بەدەستەوە دەدات، بەوجۆرێ ئەمانە ڕێگای گەیاندن بۆ هەق، کە ئەویش خودایە، لەو بارەوە گەلێ بیروڕا هەیە، چونکە لە قۆناغێکدا مورید بە هەق گەیشتووە چەندەها قۆناغی بڕیوە، هەندێ لە ئەولیاکان پێیان وایە (ئەگەر "حقوق" دەربکەوێ، ئەوا "حظوظ"

---

١ – سورة التكاثر، الآية ٥ و ٦ و ٧.

٢ – سورة النور، الآية ٢٥.

ون دەبێ) ئەمەش لەوەدایە، کە تاچەند (حقوق) بالاّ دەستی نواندووە، لە کاتێکا بوونی (حظوظ) لە جیهانێك دەبێ کە پێچەوانەی (حظوظ) ئامادەبێ، بەلاّم لێرەدا کاتێ (حظوظ) ون دەبێ، ئەوا (حقوق) دێتەکایەوە و (حقوق)یش لە جیهانێکدایە، پێچەوانە و غەیرە (حقوق) لە ئارادانیە، بەوجۆرە مانای ئەوەیە رێگای مورید رێگای خودایە بەهۆی بەدەست هێنانی ئیرادە و مەبەست و مەعریفەو حال و...، تیایدا بەمانە سەرقالّ دەبێ، هەست ناکا جیهانێکی تر، جگە لەمە لە ئارادا هەبێت، بۆیە بەهەموو ئەمانە مەشغول دەبێ و دوور دەکەوێتەوە لە ئارەزووەکانی دەروونی، بەو رادەیەی وەك لە جیهانەکەیدا بوونیان نەبێت و هەرگیز بیر لە (حظوظ) ناکاتەوە و بە پێچەوانەش بە پێچەوانەیە، ئەمەش دیارە هەرگیز (حقوق و حظوظ) بە یەکەوە کۆنابنەوە، چونکە دژ بە یەکن، ئەم هاوکێشەیە بەم جۆرە دێتە کایەوە و بەرە و هەڵکشان دەچێ و لە جیهانێکەوە بەرە و جیهانێکی تر هەنگاو دەنێ.

ئەوەی لە (حقائق) بگا، یا ئەوە لە راستیە زیادەکان (حقائق الإضافات) بگا، لەوە دەگا تا چەند ئامارژەکانی بە دەست هێناوە و هەزم کردووە، چونکە راستیەکان بۆ مەنزڵەیەکی بەرز دەچن، دیارە کە بوونی (قطب) بە ئەنقەست نابێ، هەروەك چۆن باوك بە ئەنقەست نابێتە باوکی کوڕ[1].

---

١ – معجم الفاظ الصوفية، ص١٢٦.

وه نـەبێ ئەمانـەش بـەبێ حیکمـەت دروسـت بـووین، بـەڵکو هەموویان حیکمەتێکی خوداییان لە پشتەوەیە، جا ئەگەر ئێمە پەی پـێ ببـەین، یـاخود نـەء، بەڵام لـە جیهـانی تەسـەووف گوزارشـتەکان دێنەکایـەوە، چـونکە جیهـانی بـەدی و ناپەسـەندی تـەواوی لەسـەر دەروون و دڵ دا رەش کراوەتەوە و دەبێ بەرە بەر، بە رێگەی هەق دڵ و ناوەوەی مرۆڤ پڕ بێ لە جیهانی پاکێتی و واتای مەزنێتی خودا.

ئـەم مەسـەلانەی لـە هاوکێشـەن وەك (بـاوك و کـوڕ) دوورە لـە دەسەلاتی ئێمە، لەبەر ئـەوە ئەمانـە گوزارشـتن لـە دەرەوەی ئێمـە و لـە جیهـانی پـاکێتی و دڵ و دەروون پاکیـدا سـەرەتا هەسـتی پـێ دەکـەین، پاشـان دەبیـنین، پاشـان دەیچـێژین، دیـارە ئەمانـە هەریەکەیان تاچەند دەسەلاتی هەیە و لە توانـای دا هەیـە رێ بکـا، چونکە هەریەکەیان بەخۆیانەوە پابەندە.

خـودای گـەورە (حقـائق)ی دروسـت کـردوو، لەسـەر ناوەکـانی هەق دا، و فریشتەکانی بەدەرخستووە بۆ تـەکلیف کردنـی ژمـارەی خەلقەکان، بۆهەر حەقیقەتێك ناوێکی داناوە لـە ناوەکـانی خـودای گـەورە بـە پەرسـتن و بەفێرکردنـەوە، هـەروا بـۆ هـەموو نهێنـی یـەك حەقیقـەتێکی دانـاوە، کـە بـەهۆی ئەمانـەوە تیایـدا لـەم نهێنـی و حەقیقەتـەدا، فریشـتەیێ خزمـەتی دەکـا و بـەوەوە ئـەرکی لەسـەر شـانە، چـونکە لـەناو (حقائق)ەکانـدا کـە گوزارشـتەکە رێکاکـە و پاشان بەرەو هەق، هێندە سانا نیە، بە دەروازەکـانی دا رەت بـن، بەڵام بەم پێناسانە (حقائق) بەرەو دیتنی ناوی خودایە[1].

---

1 – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٦.

ئەمەش هەر ئەو ناوەڕۆکەیە کە حەقیقەت بەبیٚ شەریعەت نابیٚ و شەریعەت بەبیٚ حەقیقەت نابیٚ، بۆیە دەڵێن: (شەریعەت ئەوەیە کە دەبیٚ بیپەرستی و، حەقیقەت ئەوەیە دەبیٚ بیناسی)[1].

لەلایەکی ترەوە هەموو ئەو ڕێگایانەی گوزارشتن لە (حقائق) بۆ خۆیان بە مەقام و حاڵی تر هەن، یاخود بەرەو ڕێگا چوون و پاککردنەوەی دڵ و دەروون جەوهەری مەسەلەکان، بەلاٚم ناوەڕۆکەکان گەلێکن کە لە جیهانی تەسەووفدا باسکردنیان زۆری دەویٚ، کە روونە (ڕێرەوی تەسەووف هەوڵ و تێکۆشانێکە بۆ گەیشتن بە پلەی خواناسی لە ڕێگەی هەستی دەروونەوە، ئەم هەستەش... هەم بە "ذوق" واتە چەشتن لە ڕێگەی دەروونەوە، نەك زوان، وە هەم بە (موشاهەدە) واتە چاوپیٚ کەوتن، "نەك چاو پیٚ کەوتنی چاوی سەر"، بەڵکو بەچاوی دەروون کە پێی ئەوتریٚ بەصیرەت هەست ئەکریٚ، وە ئەم دیتنو چەشتنانەش کە صەدەها جۆری هەیە، ئەو خۆی ئەبێتە هۆی دڵنیایی و ناسینێکی راستەوخۆ گومان لیٚ نەکراو، بەجۆرێك کە ئیتر باوەڕی مرۆڤ بەخوایەتی خوا ئەگەر نەگاتە پلەی (حق الیقین) بیٚ گومان ئەگاتە پلەی (عین الیقین) وە دەروون لە گومان ئەکەوێت و ئینسان دەس لە دڵەڕاوکیٚ و پشکنین و دوو دڵی هەڵ ئەگریٚ و بەمرازی خۆی ئەگات)[2]، چونکە تەواوی پلەکانی بڕیوە، لەبەر ئەوە لە یەك کاتدا کە ڕێرەوی تەسەووف بۆ گەیشتن بەخودا ڕەنگە لە چەندان باردا

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢ – تەسەووف چی یە ؟ ل٦٧.

هەستی دەروون بێت، یاخود لەباری پێشکەوتووتر بەصیرەت بێت، بەلاّم بمانەوێ یا نەمانەوێ لەدوا باردا هەقە، ئەویش وەك روومان کردەوە بەر لە -حق- بۆ-حقوق و حقائق- دابەشی دەبێت، ئیتر لە بارێکدا کە بەر لەوە ڕاستگۆیی و ڕاستگۆ هەیە، بەواتا بابەتی راستگۆیی و کەسێکی راستگۆ، بەلاّم لە هەقدا ئەمە نامێنێ هەردووکیان دەبن بە یەك و هەرچی بێتە ئەنجام هەر ئەوە یەکەیە کە لە راستگۆیی و راستگۆ دروست بووە، ئەم هاوکێشەیەش هێندە بە ئاسانی نایەتە دی، کە مرۆڤ بە تەواوی هەموو سیفاتەکانی (زاهید و عابید و عاریف)ی لێ کۆبۆتەوە، چونکە دەستی لە دونیا هەڵگرتووە و پشتی کردووە سەرمایە و سامان و رابواردن، هەروەها هەموو تەمەنی خۆی تەرخانکردووە بۆ خودای گەورە و بەردەوام خەریکی نوێژ و هەموو فەرمانی خودای گەورە جێبەجێ دەکا و هەروەها هەمیشە هەست و یار و سەرنجی خۆی بەلای مەزنێتی خودایە، دەیەوێ خوداوەند بە لوتف و گەورەیی خۆی دڵ و ناوەوە و دەروونی بدرەوشێتەوە و روونـاك کاتەوە و نووری خودا لە ناوەوەی دا بدرەوشێتەوە، کۆبوونەوەی هەموو ئەمانەشە دەیگەنێتە ئەم رێگایە.

بەم جۆرە (حق اليقين) ئامانجی تێکۆشەرانە بۆ گەیشتن بە (العلم الإلهي) ئەمەش راستگۆیی یەقینە، کە ئەم واتایە دەبەخشێ، کە رێبەران دەیگرنە بەر بەهۆی مەقاماتی بەرز، دەکرێ بەوەش دەربڕی کە ئەنجامی موریدی راستگۆیە بەهۆی زانستەوە بەگوێرەی تێکۆشانی، تیایدا بەدەست دەهێنا و دەتوانێ گیا بە پلەی بەرز لەوێدا دڵسۆزی و پەرستش و راستگۆی تەواو دێتە ئاراوە، بەجۆری

ئەوەندی خودای گەورە لە زانستی ئیلاهی بۆی دەست نیشان دەکا، چونکە ئاماژەکان ئەوە دەردەبڕن و لە تەواوی خەڵکی جودای دەکەنەوە ئەوەتا (إبن عطاء) دەڵێ: بەقەدەر نزیکی یان بە تەواوە، ئەوا درك دەکەن بە یەقین، ئینجا بەردەوامی تەقوا و پەرستش نەهی بەدیار دەخا، ئینجا بەدیار خستی نەهی دەروون بەدیار دەخا، بەگوێرەی دوور لێ کەوتنەوەی دەروون دەگەیتە یەقین، هەروا هەندێکی تریان دەڵێن، کە یەقین بەواتای موکاشەفەیە، هەروا موکاشەفەش بەسێ رووگە دەردەکەوێ، یەکێکیان (موکاشەفە بە هەواڵ)ە و ئەوی تریان (موکاشەفە بەدەرخستن) و ئەوی دیکەیان (موکاشەفە بە دڵ) بە راستی و راستەقینەی باوەڕ[1]، لێرەدا دەردەکەوێ کە پلەکان هەمان ئەوان کە تیایدا دەبێ (هەواڵ) بەرامبەر (علم)بێ و هەروەها (دەرخستن) بەرامبەر (عین)بێ و هەروا (دڵ) و راستەقینەیی باوەر بەرامبەر (هەق) بێت، بەڵام هەموویان بە موکاشەفە ناوبراون و لەم گوتەیەدا واتای بەدەرکەوتنی شتەکان لەسەر دڵ و دەروون و بەدەست هێنانیان بەهۆی زیکرە دەردەکەوێ، ئەوەتا (علی بن سهل) دەڵێ: (بۆ ئامادەگی باشترە لە یەقین لەبەر ئەوەی ئامادەگی بریتی یە لە زەمینەکان و(ظنات) و هەروا یەقین بریتی یە لە (خطرات) وای داناوە کە یەقین سەرەتای ئامادەگی یە لەبەر ئەوە ئامادەگی دەبێ بەردەوام بێ، لەبەر ئەوە دەبێ بەدەست هێنانی یەقین هەبێ بەبێ بوونی ئامادەگی، دەبێ ئامادەگی هەبێ بەبێ یەقین)[2].

---

١ – الرسالة القشيرية، ص١٤٢.

٢ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٢.

وەنەبێ بوونی ئەمانە بە تەنها هەبێ، بەڵام هێڵەکان ئەگەر وەك یەك سەیریان بکەین دەکەوینە هەڵەوە، بۆیە روانینی ورد گەلێ پێویستە و دەبێ ئاماژەیان پێ بکەین، چونکە بیروڕاکان لەبارەی یەقین زیاتر لەسەر ئەوە کۆکن کە یەقین بەواتای دوا قۆناغ دێ، یەقین بەواتای موشاهەدە، بەوا لە موشاهەدەدا تەواو یەقین هەیە و هیچ گومان لە ئارادا نیە، چونکە دیارە نابینرێ گەر بڕوای پێ نەبێ.

بەم پێیە (هەق و یەقین) دوا پلە لەو رێڕەوە مەزنە پێکدێنن، چونکە یەقین خاوەنی دڵە و هەق تەواوی ناوەکان گوزارشتیەتی و سەراپا قەوارەی مرۆڤ یان داگیرکردووە، و بەوەوە ئیمان دەگاتە کەماڵی و پڕی، بە یەقین خودای گەورە دەناسین بەم جۆرە (ابوبکر الوراق) دەڵێ: (یەقین سێ رووی هەیە، یەقین هەواڵ (یقین خبر) هەروا یەقین ئاماژە (یقین دلالة) و ئینجا یەقینی موشاهەدە)[1].

لەبەر ئەوە ئەم سێ گوزارشتانە (علم الیقین، عین الیقین، حق الیقین) رێڕەوی بەرز و باڵا پێکدێنن لە جیهانی تەسەووف، ئەمانە زانستی بەرزن و سنوورەکانی دیارن، بەڵام فرەوانن، بەو جۆرە بەهۆی یەقینەوە گرێ دراون بەیەکەوە و سەراپا واتای تەسەووف بەیەکەوە دەبەستنەوە و کە تیایدا هەندێکیان روونکردەوە، چونکە لە (علم) بەتەواوی رەها بەدەست نایێ و نابێت، بەڵکو لەگەڵ یەقیندا مەودایەکی دیکەی دەبێت.

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٣.

هەورا (عين اليقين) هەمان خودی یەقین کە بەصیرەتی پەیدا کردووە، لەبەر ئەوە بە تەنیا بەم جۆرە ریزکراون بەم بەهۆی هاوکێشەی ڕێڕەوی تەسەووف دەناسرێنەوە، لەبەر ئەو.

علم اليقين - هی خاوەن عەقڵەکانن.
عين اليقين = هی خاوەن عیلمەکانن.
حق اليقين = هی خاوەن مەعاریفن.

ئەمانەشی هەریەکەیان پلەیەکن بۆ پێشکەوتر و تاکو لە (حق اليقين) ناوەکان و یەقین سەراپا جەستە روونـاك دەکاتەوە، ئاستەکانیش دیارن چونکە جیهانی مەعریفەی گشتی بە عەقڵەوە دەست پێ دەکا و ئەم دەرگایە گەلێ گرنگە و لە قورئان هاتووە و بۆ ڕێگا راست کردنەوە، بەواتا عەقڵ ئاستێکی جودا کەرەوەیە کە کردارێکە مەسەلەکان، شتەکان لە ڕێگای ناراست بۆ راست و دروست دەبات، لەبەر ئەوە لە قورئانی پیرۆز بەم جۆرە هاتووە:
﴿ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾[1]، چونکە عەقڵ هی ئەوە نیە دەست بەرداری بین، دیاریشە سەرەتاکان لەم رووگەیە بۆ دروستی هاتوون، هەروا خودای گەورە دەفەرمووێ:
﴿ وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ ﴾[2]، چونکە ئەم دەروازەیەی عەقڵ بۆ عالیمەکان و ئەوانەن کە دەزانن، ئینجا دەفەرمووێ:

---

[1] – سورة البقرة، الآية ٤٤.
[1] – سورة العنكبوت، الآية ٤٣.

﴿ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴾[1].

گەورە پیاوانی ئاپین پێیان وایە عەقڵ زیاتر لە واتایەکی هەیە، لەلایەك واتای راستیەکان دەگەیەنێ، عەقڵ واتە عیلم کە جێگای بەرە و دڵە، نەك ئەوە بەڵکو شوێنەکەی خودی دڵە، هەتا ئەمە لای ئیمامی (غەزالی) (دڵ و روح و عەقڵ) هەموویان جێگەیان دڵە[2].

هەرچی واتای ترە بەواتا ئەو بەشەی کە مرۆڤ درکی پێ دەکا، کە دیسان دڵە، چونکە دڵ درك بە زانستەکان دەکا، بەواتا ئەو جێگای درککردنی زانستەکانە ئەمەش زیاتر دەیگەرێنێتەوە بۆ سەرەتای گەردوون لە پێناو چەسپاندنی.

ئینجا عیلمەکانیش دەرکەوتن بەهۆی (علم الوهبی)یەوە و لەناو ناخی مرۆڤدا گوزەر دەکا، ئینجا بۆ (حق اليقين)، لەبەر ئەوە سەرەتا (علم اليقين) واتە دڵنیایی و باوەڕ لە رێگەی زانیاریەوە، وەکو ئەوەی تۆ ئەچیتە شارێك وە ناشارەزایت ئەتەوێ بڕۆیتە چاخانە، یان چێشتخانەییێکەوە بە پرسیارکردن، یان بەخوێندنەوەی سەردەرگای ئەو شوێنە، وا بۆت دەرکەوت کە ئەمە شوێنی خواردن یان خواردنەوەیە، بەمە ئەڵێن: (علم اليقين)، واتە دڵنیا بوون بەهۆی زانیاریەوە، چونکە بەپرسیار یان بەخوێندنەوە بۆت دەرکەوت، کەئەبێ ئەمە چاخانەبێ، بەڵام ئەم باوەڕە ناتەواوە، بۆ؟ چونکە بگرە ئەم نوسینە هی ماوەییێکی کۆن، یان تازەی لەوە و پێش بێت و

---

٢ – سورة البقرة، الآية ١٦٤.

٣ – معجم الفاظ الصوفية، ص٢١١.

ئێستە ئەم شوێنە کرابێتە شتێکی تر، یان هەر بەتاڵ بی"[1]، لەمەوە لە (علم الیقین) پلەی یەکەم هەندێ ئامارە هەن ئەمانەن (درككردن، عەقڵ، باوەڕ، گومان) لەمانە روونە پرسیار و زانین گرنگن، چونکە ئەم ئامارانە گەلێ فرەوانن، بەلاّم لە توانایان دا نیە سەراپا یەقین بەهەق دروست بکەن، لە کاتێکا هێزی پرسیار هاتۆتە ئارا، بەلاّم بوونی گومان پێویست بەقۆناغی تر دەکا بۆئەوەی واتاکان بناسین لە دەرەوەی خۆیاندا ئێستا ئەم ئامارانە خۆیان راڤە کردووە و دێنە ئاراوە، بەلاّم هیچ کەرەستەیەکمان نین بۆ ناسینەوەیان، لەمەوە دەزانین و درکمان کردووە، هەروا بڕیارمان داوە بەعەقڵ وەك جودا کردنەوەی راستیەکان و راستەقینەکان و مافەکان، هەروا بڕوامان هێناوە، بەلاّم هێزی پرسیار ئەوەیە: ئایا چ باوەڕێك؟ هەروەها جەوهەری مەسەلە ئەوەیە گومان بوونی هەیە، لەبەر ئەوە لە (قۆناغی دووهەمدا ئەڕۆیتە ناوەوە وە بەچاوی خۆت ئەبینی کە خەڵك خەریکی خواردن وە خواردنەوەن لێرەدا بەچاو دیتن، کەواتە دڵنیاییەکەت زیاتر بوو وە (عین الیقین) واتە بەچاوی خۆت دیت.

بەلاّم ئایا ئەم دیتنە وات لێ ئەکا بزانی تامی ئەو خواردنانە چۆن؟ بەتایبەت کە تۆ نەزانی خواردنەکان چین!! وا دانێ نوسرابێ خواردنی (چینی) ئایا ئەم دیتنە ئەتوانێ تێرت کات، برسی و تینوییەکەت لابات؟!! یا بزانیت تام و مەزەی خواردنی چینی چۆنە؟! شتێك تا نەیچێژی ئەکرێ لەزەتی لێ بەریت؟!"[2]، لێرەدا

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ل٤٧.

٢ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٨.

توانا و هێزی دیتن بەدەردەکەوێ، ئەمەش لە دونیا لێکۆڵینەوەکان وەك دەری دەخەن، گەلێ پێگەی لەسەر وەستاوە، ئەمە لە واقیعیدا، بەلأم ئایا لە جیهانی تەسەووف رۆڵ دیتن چۆن دەکەوێتەوە؟!! وەك باسمان کرد چاو ئامرازی دیتن و بەبێ ئەمە لە رووناکی مەحروم دەبین، ئەم هەستەش گەلێ شتمان بەرزی پێ دەناسێنی، بەلأم لە کاتێکا تەسەووف جیهاد و رێڕەوی ناوەوەیە و پاکێتی دەسەلمێنێ، ئەوا چاومان دا بە دڵ، ئایا چ مەزنییەتیەك دەخولقێ، چاوی دڵ (بەصیرەت) قۆناغێکی مەزنە لە تەسەووف، بەرەو درەوشانەوە رووناکی سەراپا جەستە دەچێ، ئینجا پاش ئەم زانیارییانە، زانیاری دێن، پلەی سێیەم (حق الیقین) دێت، کە (واتە ئەوپەڕی تێ گەیشتن ئەوپەڕی دڵنیایی و زانیاری، کە ئەویش بەخواردنی خواردنەوە تام و مەزەکردنی جۆری خواردنەکان، وە تێرو تەسەل بوونی پەیدا ئەبێ، بۆیە ئەبێتە ئەوپەڕی دڵنیایی و زانیاری چونکە بەتام و مەزەکردن و تێر بوون هاتوەتەدی، جا بەم جۆرە تێ گەیشتنە ئەوترێ "حق الیقین")[1]، بۆ ئەم زانیاریانەش دەبێ پشت بە رادە و توانای هەڵسوڕێنەر و بەدیهێنەر ببەسترێ، کە بەڕێوەبەری ئەم جیهانەیە، لەبەر ئەوە کاری خواناسیش لە رادەی (حق الیقین)دا بێ کۆتایی یە و لە تەواو بوون نایەت، لە (حق الیقین) هیچ گومانێ رووناکاتە دەروونت، لەبەر ئەوە زانینەکان دەبێ بگەن بە پایەی باوەڕ، ئەگینا لە دەرەوەی ئەمە هەمیشەیی نابن و بەرە و بارەگای کاتی دەڕۆن، چونکە تەواوی یەقین بەدەست

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو.

نایێ، بۆیە کاکڵەی زانیاری لە (یقین)ەوە دەست پێ دەکا، ئەوەی لەم رووەوە ئیمامی (غەزالی) دەڵێت: (من لە دڵی خۆما ئەم وت من ئەمەویَ لە کاکڵەی زانیاری بگەم وە بیدۆزمەوە، لێرەدا بوو بۆم دەرکەوت زانیاری باوەڕ پێکراو (یەقین) بەشێك ئەڵێن کە مرۆڤ بەچاوی خۆی ببینێت و هەستی پێ بکات، جا کەزانین گەیشتە ئەم پلەیە ئیتر هیچ گومانی تیا نامێنێت و دڵ ئۆقرە ئەگرێت و ئۆخەی ئەکات، "بەو مەرجەی ئەو کارەی هەڵەی تیا نەبێت" هەڵە، وەکو ئەوەی کەسێ بێت لەبەر چاوتەوە بەرد بکات بە زێڕ، یان گاڵۆکت بۆ بکات بە مار، ئەمەیان بەچاو دیوتە، ئەبێ باوەڕیشت پێی هەبێت... بۆم دەرکەوت هەر زانینێك نەگاتە ئەم پایەیە لە باوەڕ، ئەوە زانینی باوەڕ پێ نەکراوە، وە (یەقین نیە) جا من بۆگەیشتن بەو زانینە و بەو باوەڕە بەر لە هەموو کەسێ، خۆمم پشکنی، سەیرم کرد من خۆم جگە لە زنیاری هەست پێکراو و ئاشکرا، ئیتر لەو زانینە (یەقین)یە بێ بەهرەم)[1].

ئیمامی(غەزالی) گەورەترین عالیمی سەردەمی خۆی بووە و بەدوای پشکنین بووە لە نێو زانستەکان گەلێ چەمکی راڤەکردووە و هەوڵی داوە تیایدا بگیرسێتەوە و لەسەر ئەم ریگایەبێ، تاکو لەم نێوەندەدا (حق الیقین) هەڵدەبژێری و ئەم گۆڕەپانە دوای تاقیکردنەوە بە بەراورد لەگەڵ هەموو عیلم و رێگەکان بە هیچیان نادا، لەبەر ئەوە درێژەی پێ دەدا و دەڵێ: (من هەر بەم چەشنە لە خولیا و گەیشتن بە(یەقین)دا بووم وە لە ناوی دروون، نەك بە

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ل٩٣.

زوان، هەمیشە لە وتوویێژ و پرسیار و وەڵامدا بووم، تا لە کوتوپڕێکدا خوای گەورە چارەی بۆ ناردم وە لە نەخۆشی و ناسازی رزگار بووم، وە بۆم دەرکەوت کە ئاوەزی مرۆڤ جێگای باوەڕە و، هەر ئاوەزە کە ئەبێتە ڕێ پیشاندەری مرۆڤ بۆ خستنەکاری توانایی دەروونی بۆ گەیشتن بەهەوارگەی باوەڕی تەواو، ئەمەش خۆ بەدەستی خۆم نەبوو، بەڵکو بە نوورێك کە خوا بەکەرەمی خۆی خستیە دەروونەوە... سەبارەت بە (شرح الصدر) لە پەیامبەری گەورەیان(ﷺ) پرسی؟ فەرمووی: "نوورێکە خوا ئەیخاتە دەروونەوە")[1].

بەمجۆرە (یەقین) پلەیەکە دەبێ پێی بگەین، ئەویش لە ڕێگەی تەسەووف دەبێ، لەبەر ئەوە گەیشتن بە پلەی (یەقین)، مەبەست لە یەقین خواناسی یە، بۆ ڕێبوارانی موسڵمان، ئەوانەی تەنها پاکێتی دەناسن، تەنها پاکێتی دەزانن ئەم ڕەوشە هەیە بۆ گرتنەبەری، دیاریشە تەنها لە ڕێگەی (پاکێتی دەروون) (تزکیة النفس)ەوە دەبێ، واتا تا ئەو ساتەی دەروون دەست دەدات و تەواو پاکراوەتەوە و پاکردنەوەی دەرونیش لە ڕێگەی خوا پەرستێکی گەرم وە خۆ خستنە نێو پێناسە پەسەندەکان، کە کۆمەڵێ تاریفن دێنە کایەوە و دەربڕی خۆیان هەیە، هەروەها دەبێ دوورە پەرێزی و دوور بگرین لە پێناسی ناپەسەند وە بەردەوام بین لەسەر زیکری خوای گەورە، جا خودی دەست نیشانکردنی ئەم زیکرە چ بەزمان یاخود بە دڵ بێت، واتا چ بە

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩٣.

ئاشکرا و چ بە نهێنی، چونکە یەك ڕێگە و یەك ئامانجیان هەیە، جا ئەمەش چ بەهۆی چاودێری مورشید، یان بەبێ مورشید بێتە کایەوە، بەڵام زانینی ڕێگەکان و پەی بردن پێیان و باوەڕ تیایدا مەرجی سەرەکین، دیاریشە سەرەتا و دەروازەی کار دەبێ بە (تەوبە) دەست پێ بکات و هێڵێکی جوداکەرە، وە دەبێ لەم ڕووەوە، وە دەبێ مرۆڤ هەتا هەتایە ئەو تەوبەیە بباتە ڕێگاوە و لەسەر ئەم زیکر و پەرستشە گەرمەیە بەردەوام بێت، بەشێوەیەکی هەمیشەیی، تاکو خوداوەند لەخۆی ڕازی دەکات، خوایش کە لەیەکێ ڕازی بوو درەوشانەوە و تابشی خۆی دەخاتە ناخیەوە و دەروونی لێ پڕ دەکات، کاتێ نووری خودا لە دەروونیا درەوشایەوە، نهێنی جیهانی مەعنەوی دەست ئەکاتە درەوشانەوە و دەرکەوتن، بەم پێیە دەروون ساز و ئامادە دەبێ بۆ ئەوەی پایە و مەقامی مەعنەوی دەس کەوێ، لەمەوە دەروون خۆی هەموو شتێکی بۆ دەردەکەوێ و تیایدا (بەصیرەت) چاوی دەروون جێگر دەبێ و دەکرێتەوە، لەم ڕووەوە باوەڕ پلە بە پلە و قۆناغ بە قۆناغ هەڵدەکشێ بۆیە بە چاوی دەروون (دەوترێ (بەصیرەت) چاوی دەروون کە کرایەوە و پەردە لەسەر (إسرار) لابرا، باوەڕ دەبێتە باوەڕی (عین الیقین)، مرۆڤ کە خۆی شتی بەچاوی خۆی دی، باوەڕ کوا لەوە گەورەتر و ئاشکراتر ڕێگە و ڕەوشەکانیش، هەروەکو وتمان (زیکرە) بە زمان یان بە دڵ، بەتایبەت زیکری(الله) یان (لا إلە إلا الله) کە پێشی ئەڵێن (نەفی وە ئیسبات) (لا إلە) نەفییە، (إلا الله) ئیسپاتە، هەروەها (مراقەبە) ئەویش بریتی یە لەوەی بە دەستی بەدەس نوێژەوە لە شوێنێکی خاوێن و بێ دەنگا

پاش پاڕانەوە و داوای لێ بوردن (أستغفر الله) کردن رووی دەروون ئەکەینە بەر دەرگای خودا بۆ ماوەیێکی زۆر، واتە تا بۆت بکرێت، سەعاتێ، یان دە سەعات، هەرچی بۆت کرا، وە زۆر کەس لەم چەشنە کەوتونەتە بەرکەرەمی خودا و نوری خوا لە دەروونیا نا درەوشاوەتەوە، ئەبێ ئەوەش بزانین موراقەبە کە بریتی بێت لەوەی کە خوا بەچاودێریکەر و (ناظیر)ی هەڵسونیشتی خۆت بزانی، ئەوە یەکێکە لە رەفتار و رەوشتی صۆفیەکان، ئەمەشیان کە بەتایبەت دانیشیت وە لە دەروونەوە چاوەڕوانی کەرەم و بەخشندەیی خوا بیت، ئەو تێکۆشانە بۆ بەرهەم وەرگرتن لە موراقەبە)[1].

بەمجۆرە دەبێ خودای گەورە بە هەڵسوڕێنەر و بینەر(ناظر) ی هەموو کردەوەیەك بزانرێ و هەروەها بەوی کە چاودێری کردن و پاڕانەوە بۆ کەرەمی خودا بێت هەروەها پەروەردە بوون بە دەستی مورشیدێکی (کامل و مکمل) واتە پێگەیشتوو و پێ گەیێنەر بێت، چونکە بەڕاستی بووە موڕشیدی لەم جۆرە رێگاکان زووتر بەرەو مراز دەبات، بەم جۆرە بە یەقین شاد دەبێت.

لەمەوە چ لە رووی تیۆری و چ لە رووی جێبەجێ کردن کون و کەلەبەری (علم اليقين و عين اليقين و حق اليقين)مان ناسی کە چۆن لە رووی تیۆری ئەو مەغزا بەرزانەی لە خۆی هەڵگرتوو!!!.

وە لە رووی جێبەجێ کردنەوە چۆن دەستپێ دەکا و چۆن دەگا بە مراز!!!.

---

١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٩ و ١٧٠.

له راستیدا ئەم بابەتە گەلێ فرەوانە، بەلاّم لێ کردنەوە لێی دەبوا بـەم شـێوەیە بێـت چـونکە خـودی تەسـەووف بابەتـەکانی گـەلێ تێکچـڕژاون لەمـەوە مـەزنێتی (علـم الـیقین وعـین الـیقین وحـق الیقین)مان لە ڕێڕەوی تەسەووف بۆ دەردەکەوێ.

# فەلسەفە و تەسەووف

گەر باس لە پەیوەندی نێوان تەسەووف و فەلسەفە بکەین، نابێ تەنها یەك روانگە وەربگرین، بەڵكو لەگەڵ ئەوەی نێوانیان بابەتێکی فرەوان هەڵدەگرێ، لە هەمان کاتیشدا دوو لایەنی تریش دێنە ئاراوە یەکەمیان خۆ لەوە دەنوێنێ لە تەسەووفەوە سەیری فەلسەفە بکەین، هەروا دووەمیان لە فەلسەفەوە سەیری تەسەووف بکەین، بەم جۆرە سێ بار خۆی دەنوێنێ:

١) نێوان تەسەووف و فەلسەفە.

٢) روانگەی تەسەووف بۆ فەلسەفە.

٣) روانگەی فەلسەفە بۆ تەسەووف.

رەنگە خاڵی یەکەم و دووەم لای لێ کرابێتەوە و لەبەشەکانی ئەم کتێبەدا ئەوەمان دەسکە نەکردبێ و بەهۆی چەند زاراوەیەکەوە باسمان لە پلەکانی ئیمان و (علم الیقین) و(عین الیقین) و(حق الیقین) کردووە، تیایدا بە تەواوی مەغزای تەسەووف دەخەنە روو بۆ فەلسەفە، هەروا جگە لە چەند زاراوەیەکی تر و بابەتی قووڵی تر کە دەچنە هەمان بابەت، لەبەر ئەمانە لێرەدا تەنها لا دەکەینەوە بە روانگەی فەلسەفە بۆ تەسەووف، چونکە بمانەوێ یا نەمانەوێ لە کاتێکدا دوو رەوش لە ئارادا هەن، یەکیان رەوشی روحی ئەوی تریان رەوشی فیکری، بەڵام ئەمانە بێ کارلێك کردن نەهاتوونەتە ئاراوە و بۆ خۆیان رێڕەویان هەیە، هەرچەندە ئەمەش باسێکی

فرەوان و روانگە کتێبی دەوێ بۆ ئەوەی باس لە هەموو لایەنەکانی بکرێت، ئەوەی دەمێنێتەوە ئێمە ئەم رەوشانە بەتەنها باس ناکەین، بەڵکو ئەوە دەکەینە پێوەر کە چلۆن مامەڵەیان کردووە لەگەڵ قەوارەی مرۆڤ!!!، روانگە چی یە لەگەڵ کارلێك کردن و روو بەروو بوونەوەی لەگەڵ سروشت دا؟!!، لەلایەکی ترەوە گەر لە فەلسەفەوە سەیری تەسەووف بکەین، تاکە گرفتێك تووش ببێت" ئەوەیە کە فەلسەفە لە خاکی یۆنان سەری هەڵداوە و گەشەی فرەوانی بەخۆوە دیوە، لێرەدا وەك لایەنێکی تەواو دەرەکی چلۆن کاریگەری بەسەر تەواوی کەلتووری ئیسلام هەیە؟!! هەروا بە تایبەتی تەسەووف!!! بەڵام دەبێ ئەمە وامان لێ نەکا کە بڵێین بێگومان لەوەوە سەری هەڵداوە، مەسەلەکان بەم جۆرە نیە، بەڵکو خۆی لەوە دەدۆزێتەوە کاتێ لە گەردوون دەروانین، لە دەوروبەرمان دەڕوانین، دەمانەوێ رێڕەوێك دەست نیشان بکەین، گەڵێ تیژی تر، بەم هۆیانەوە کۆمەڵێ چەمك کاکڵە دەکەن و دێنە کایەوە، هەروا دەبێ ئەمەش لە یاد نەکەین کە گرنگترین خاڵ لەم مەسەلەیەدا پەیڕەوی لێکردنە لە قورئانی پیرۆز کە تاکە بنەمایە بۆ سەراپا کۆمەڵگای ئیسلام بووەتە بەرنامە رێزی و چەمك کێشان، لەمەوە بەواتا دوای ئەم سەقفە بوارەکان وەبەرهاتوون، لەم روانگەوە بمانەوێ بینینی فەلسەفە بۆ تەسەووف بەدی بکەین، لەسێ رێڕەودا بەهۆی سێ رەوشەوە دێنەکایەوە، ئەم رەوشانەش بە ئیشکالات ناوبراون بەواتا سێ ئیشکالاتی تەسەووف:

ئیشکالی یەکەم: دەتوانرێ بەگشتی وەسفی تەسەووف بکرێ، کە هەوڵ دەدا بۆ گەیشتن بەنهێنی (کائن)ی ڕەها، بەواتا (هەق)، یا ئەوەتا بەهۆی ئیدراکی عەقڵی یەوە دەبێت، یاخود بەهۆی گەیاندن (الإتصال)، ئەم ئیشکالە بەوە جودا دەکرێتەوە کە لەلای ئیفلاتۆنە نوێیەکانی عەرەبدا بەدی دەکرێ، چونکە تەسەووف هەرگیز کۆڵ ناوا لە پێناو گەیشتن بە (هەق)، ئەمەش وەك هێڵێکی ستوونی و ئاسۆیی کشاوە بە ناواخنیەوە.

ئیشکالی دووەم: بەو پێیەی تەسەووف بەرەو (حەق) هەنگاو دەنێ بەهۆی بەرزترین پلەی ئیمان کە خۆی لە (حق الیقین) دەدۆزێتەوە، تیایدا لەم مومارەسە روحی یەدا (موکاشەفە) یاخود (چەشتن) رۆڵی کاریگەر دەگێڕێ، ئەم ڕێگەیەی تەنها لە تەسەووفی ئیسلامی دا بەدی دەکرێ و هاوشێوەی بەم جۆرە گەلێ ستەمە، کە لە بەرزترین پلەی دا دەیەوێ بە واقیع خۆی تێکەڵ بکاتەوە.

ئیشکالی سێیەم: لە ڕێگەی (فەنا)ی خودەوە و گەڕانەوە بۆ باری (وحدانیە)ی ڕەها، لەم ئیشکالەتەدا بیروڕای دەرەوە تێکەڵ بە تەسەووف کراوە، ئەمەش گەلێکی دەوێ، بەڵام ئەمانەی لە ڕێگایانەوە بەدەست هاتوون خاڵی گرنگ تیایاندا ئەوەیە، لەسەر بنەمای ئیمانەوە بەدەست کەوتووە، لەبەر ئەوەش بیروڕاکانی دەرەوە لەگەڵی جودا دەکرێنەوە چونکە تەسەووف بەهۆی ئیمانەوە بەدەست هاتووە، کە بڕوا بوونە بە کتێبی پیرۆز و حەدیسەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەمەش لەم گەردوونەدا، دوا پەیامە بۆ هەموو ئادەمیزاد.

ئەم ئیشکالاتانەش هێڵی گرنگن لەو لاڵ کردنەوەی فەلسەفە ڕێکی دەخا، بەم شێوازانە لە سەرهەڵدان و پەرەسەندن و ڕێڕەوی لەخۆ دەگرێ لەم رووەوە دەتوانین ئەم ڕێڕەوانە دەستنیشان بکەین کە گومان نیە بۆ ئاماژە پێدانیان لە کەسایەتیەك بۆ کەسایەتیەکی تر زاراوە و حاڵ و جۆری پەرەسەندن دەستنیشان دەکا، لەبەر ئەوە چوارچێوەکان هەوڵەکانیان لەم ئەولیایانەی ڕێگەی هەق دەدۆزێتەوە:

لە (حەسەنی بەسری)یەوە بۆ (رابیعەی عەدەوی)بە یەکەم قۆناغی پەرەسەندنی تەسەووفی ئیسلامی بەوە ناسراوە، کە لەباری عەبد بەقووڵی دەڕوانێ و تیایدا راماوە، بە واتا ئەو ڕێبوار (سالیك)ەی لە ڕێگەی یاخود لە پێناو خودا دا (السالك سبیل الله)، کە ڕێبوار لەم ڕێگەیەدا لە (دار الفنا و)ەوە دەڕوا بۆ (دار البقا و) بەردەوام پەیوەندی بەخودای گەورە بە شێوازێکە، وەك چۆن قورئانی پیرۆز باسی لێوە کردووە:

﴿ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴾[1].

بەم هۆیەوە لە نێوەندە ئایینیەکاندا گیانی زوهد و دوورکەوتنەوە لە دونیا، دوورکەوتنەوە لە ئارەزووەکان گەشەی کرد، ئەمانەش لە هەناوی کۆمەڵگای ئیسلام وا هاتنە کایەوە، لەو سەردەمەدا رامان و شیکردنەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز خەریك بوو بەجۆرێ دەهاتە ناوەوە کە سەراپا بەهاکانی کۆمەڵگا بگرێتە خۆی بێگومان ئەمەش لەلایەکەوە بە کۆمەڵێ ئاست دەورە

---

١ – سورة ق، الآية ١٦.

دراوه کە (عەقیدە)ی لیّ هاتە کایەوە و بەخوولی گەشەی سەند و بنەماکانی بۆ دانران، تاکو مرۆڤی موسڵمان چاو لە ڕێنماییەکان بکا، بەڵام لێرەدا ئایا لەم گەشە کردنە تەسەووف لە کوێدا ئاستی گرتووە؟!! لێرەدا مەسەلەکان لەوە دەردەچیّ مرۆڤی موسڵمان چاوی لیّ بکا، بەڵکو دڵی بۆ تەواوی ڕێنماییەکان دەخاتە ئامادەباشی، لەوکاتەوە کە ترس (الخوف) بووە رووکارێك لە رووکارەکانی تەقوا و عیبادەت، ئەمەش وەك سەرەتایەك لە زوهدە هاتەکایەوە و پشت کردنە دونیا و شت کردنە ئارەزووەکان و هەوا و نەفس ئەمانە هەمووی لەسەر گوزشتەکان و وەعزەکانی حەسەنی بەسری(مەرگ ١١٠ك\٧٢٨ ز) دەردەکەوێت، چەندان جار ئەمەی درکاندووە بەگویّ خەڵکدا و خۆشی وەك عابید و روو لە خوا بەردەوام ئەمەی جێبەجیّ کردووە، وەك ناسراوێك لە بیری ئاینی ئیسلام جێگەی دیاری هەیە و مێژووش ئاماژە بەمە دەکا.

حەسەنی بەسری یاوەران و ڕێبوارانی خۆی ئاگادار کردۆتەوە کە دەروونی خۆیان موحاسەبە بکەن و بیر لە مردن بکەنەوە، مل کەچ بن بۆ ئەوەی خودا بە تەواوی دەیەویّ، ئەم بیرانەی بەنێو تەواوی خەڵکی دا بڵاو دەکردنەوە هەتاکو زوو لە شاری بەسرەدا لەتەك حەسەندا ئەلقەیەکی زوهد پەیدا بوو، ئەمەش تا رادەیەکی زۆر خۆی لە بزافێکی ئایینی دەدۆزیەوە، لە مێژووی تەسەووف ئامارژە بە رۆڵی شاری بەسرە دەکرێت و بە زوهد ناسراوەتەوە، چونکە وەنەبیّ ئەمە هەر تەنها لەو شارەدا ئۆقرەی گرتبیّ، بەڵکو لە شارەکانی دیکەی وەك (بەغدا و کوفە و خوراسان) گەلیّ ڕێگەی تر بۆ پەرستش هاتنە کایەوە و بۆخۆیان پێناسیان هەبوو، بەڵام

بەر لە هەر شتێك قۆناغی یەكەم لە پەرەسەندنی تەسەووفی ئیسلامی لە زوهدی بەسرەوە دەست پێ دەكات، دوای دروست بوونی ئەم ئەڵقەی زوهدە كە خۆی لە كتێبی پیرۆز و ئەحكامەكانی دەدۆزێتەوەو تیایدا (زاهید) پشت لە دونیا دەكا و ئارەزووەكان بەلاوە دەنێ، لەنێو ئەم ئەڵقەیەدا هەر لەم قۆناغەدا بەواتا جیلی دووەم بزافی زوهد گەلێ پەرەسەندنی بەخۆوە دیوە و بیرورای وا هەن كە مەغزاكانیان تا ئەبەد لە دونیای پەرستش دا بێ نموونەن، هەوڵ و تێكۆشانەكانیان بێ نموونەن، رابیعەی عەدەویە یەكێكە لە بەرزترین كەسایەتی جیلی دووەم لە قۆناغەدا، تەواوی ژیانی لە شاری بەسرە گوزەراندووە، ژیانی زاهیدی ژیاوە، رابیعەی عەدەویە بە تەواوی سوودی لە پەیامەكەی حەسەنی بەسری وەرگرتووە و بە تەنیا ژیاوە و دەستبەرداری هەموو شتێ بووە لە دونیادا و پشتی تێ كردووە، رەنگە لە ژیانیدا وەك چۆن لەسەرچاوەكان باسی لێوە دەكەن گەلێ تاقیكردنەوەی بە دەرگا لێكردنەوەی ژیانی بۆ رەخساوە، بەلام بەردەوام یادكردنەوەی خودای گەورەی كردۆتە پێوەر و سەنگی مەحەك، یەكەم مەسەلە و دوا مەسەلە هەر ئەوەی لا گرنگ بووە، ئەگینا لە كۆختەكەی لە بەسرە ناسراو بوو بە ماڵی ژنە هەژارەكەی بەس روو لە خودا، خەڵكی بۆ یارمەتی دانی مادی و بۆ مەسەلە دونیاییەكان دەچوونە لای، بەلام ئەو پەیوەندی لەگەڵ دروستكاری ئەمانە هەیە، چ حاجەت دەكا لا لەمان بكاتەوە، بەم شێوەیە رابیعەی عەدەویە لە ژیانی روانیوە، نەیهێشتووە (نەفس)ی لە دەست خۆی دەربچێ، نەیهێشتووە دڵی داگیر بكرێ و هەواو نەفس و ئارەزوو چۆكی پێ دا بدەن.

ئەو فیکرەیەی بە تەواوی تەسەووف کشاوە و لایەنێکی گرنگ پێکدێنێ و رابیعەی عەدەوی یە بۆ یەکەم جار رەواجی پێداوە و بگرە وەك پێناسێك هاتۆتە ناوەوە (مەحەبەتی ئیلاهی) بوو، دیارە زاهیدە بەراییەکانی تەنها بە قسە لایان لە درەوشانەوە کردووە، بەڵام رابیعە بە قووڵی چووەتە نێو مەغزایەکی هەمیشەیی و بەرفرەوان رووی کردۆتە عیشقی خودایی و بە پلەیەکی بەرز گەیشتووە دەگێڕنەوە لێی، جارێکیان کەسێ پرسیاری لێ کردووە: ئایا تۆ خودات خۆش دەوێ و رقت لە شەیتان دەبێتەوە؟!! وەڵامی داوەتەوە: (خۆشەویستم بۆ خودا قەدەغەی کردووم کە مەشغول بم بەرق لێ بوونەوەی شەیتان).

لەوبارەوە گەلێ رووداو هەن گوزارشت لە مەحەببەتی خودایی (رابیعەی عەدەوی)یە دەکەن بەڵام گوزارشتەکان لەو فکرە قووڵەدا لە فیکری عیشقی خودایی دەرناچن، هەروا گێڕانەوەی دیکەش هەیە، کەوا خۆشەویست (محمد ﷺ) جارێکیان هاتۆتە خەونی و لێی پرسیوە: ئەی رابیعە! منت خۆشدەوێ؟ ئەویش وەڵامی داوەتەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! کەسێ هەیە تۆی خۆش نەوێ؟! بەڵام خۆشەویستیم بۆ خودای گەورە هەموو دڵی پڕ کردووم، بەجۆرێ هیچ شوێنی نەهێشتۆتەوە بۆ خۆشەویستی و رق لێ بوونەوەی ئەوانی تر.

رابیعە(رەحمەتی خوای لێبێ) گەلێ شیعری دراوەتە پاڵ کە گوزارشت لەو خۆشەویستی یە مەزنە دەکەن جا ئەو شتانەی لە دوای خۆی بەجێی هێشتوون هەموویان باری مەعنەوی بوون، بریتین لە مەحەببەت و رێگەی تەسەووفی ئیسلامی، رابیعە

هەمیشە یادکردنەوە و بیری تەرخان کردووە بۆ خودای گەورە، لەم روانگەوە بۆ هەموو ژیانی رانیوە و پێ وا بووە دەبێ بیر لە هەمیشەیی یەکان بکاتەوە، نەك كاتی یەکان، لەبارەی وەسفی بۆ ئەم خۆشەویستی یە لە جوانترین ئەم دێرانەدا بەم شێوە دەهۆنێتەوە:

أحبك جين حب الهوى وحباً لأنك اهل لذاكا
فأما الذي هو حب الهوى فشغلي بذكرك عما سواكا
واما الذي انت أهل له فكشفك للحجب حتى اراك[1].

بەرەو شاری بەغدا (المحاسبی) و (الجنید):

هەرچۆنێك بێت ئەو بزافە شاری بەسرە و دەوروبەری گرتبۆوە، وە نەبێ بکەوێتە بارێکی هەڵپەسێردراو و پاشان روو لە هەڵدێر بکا، بە پێچەوانەوە لە تەك شاری کوفەدا گەلێ مەسەلەی گرنگی لێ وروژێندرا بەگشتی و تیایدا مەسەلەی زوهد و پەیوەندییەکانی لە نێوان دونیا و ئاخیرەتدا و لێکدانەوەکان و خستنەرووەکان بە تایبەتی گرنگترین مەسەلە بوون، دوای ئەمە بزافی تەسەووف پەرەی سەند و رووە و شاری بەغدا هەنگاوی هەڵێنا، ئەمەش لە مێژووی تەسەووفدا و لە رووی فکریەوە بە وەرچەرخان دادەنرێت لە ساتێکا کە لە زوهدەوە رووی کردۆتە تەسەووف، بەواتا لە ئاستێکەوە بۆ ئاستێکی تر هەنگاوی هەڵێناوە، بۆیە باسکردنی شاری بەغدا وەك چەقێکی گرنگی سەردەمی خۆی و رۆڵی لە

---

١ - الشعر الصوفي، عدنان حسين العوادي، ص١٢٨.

تەسەووف دا گرنگترین ئەو بوارانە پێك دێنێ، لە شاری بەغدادا گەلێ سۆفی گەورە و رووداو لەم بارەوە هەن، (معروف الكرخي) یەكێ لە پیاوە گەورەكانی تەسەووفە لە ساڵی (٢٠٠ ك\ ٨١٥ ن) وەفاتی كردووە، هەروەها ئەم شارە چەندەها پیاوی گەورەی لە خۆگرتووە، كە لە رێگەی تەسەووف و پەرستشدا تێكۆشاون، لەوانە (بشر بن الحافي) (٢٢٨ ك\ ٨٤٢ ن) وەفاتی كردووە و (مالك بن دينار)(٢٨١ ك\ ٨٩٤ ن) وەفاتی كردووە، بەلاّم لە مەزنترین ئەوانەی تێكۆشاون دوو پیاوچاكن.

١) (ابو عبدالله الحارث المحاسبي) (٢٤٣ ك\ ٨٥٧ ن) وەفاتی كردووە.

٢) (ابو القاسم الجنيد البغدادي) (لە ساڵی ٢٩٨ ك\ ٩١٠ ن) وەفاتی كردووە.

١) <u>(ابو عبدالله الحارث المحاسبي)</u>: لە شاری بەسرە لە دایك بووە لە كاتێكا كە بزافی زوهد دەمێك بوو گەشەی سەند بوو، بگرە لەگەڵ شارەكانی تری وەكو كوفە پێیەوە دەناسراوە، دیارە بەسرە بە زوهد نێوبانگی دەركردووە و تیایدا دوای رووداوەكان لە بارەی خەلافەتەوە كاردانەوەیان بەسەر كۆمەڵگای ئیسلامەوە، گەلێ بیرو بۆچوون و قوتابخانە هاتنە ئاراوە، كە كاریگەرییان بەسەر رەوشەكان بەگشتی هەبوو، مێژووش باسی ئەو ناوچانەی كردووە كە قوتابخانە و تایەفە و رێبازەكان سەریان هەڵداوە و بەقووڵی بە كۆمەڵگای ئیسلامەوە لكان و لە رەوشی سیاسی شوێنیان دیارە.

(المحاسبي) له نێو ئەم رەوشانەی بەسرە سەری هەڵداوە و پاشان رووی کردۆتە شاری بەغدا، وەك روونە دوای ئەوەی شاری بەغدا وەك چەقی جیهانی ئیسلامی هاتە ناوەوە و لە رووی شارستانییەوە پەرەی سەند و نەتەوەکان لە ژێر پەرچەمی ئیسلام دا چەندەها بەرهەمی مەزنیان پێشکەش کرد.

لەمەوە (المحاسبي) لەم شارەدا لەگەڵ حەنبەلییەکان کەوتە ناکۆکی، لەبەر ئەوەی هەندێ لە رێبازەکانی (علم الكلام)ی لا پەسەند نەبوو کە ئاینیان شی دەکردەوە، لەبارەی (المحاسبي)یەوە وەك پیاوێکی مەزن باسی لێوە کراوە کە لە تێکۆشان دا رۆڵی مەزنی هەبووە و پەیڕەوی لە ئەحکامەکانی پەرستش کردووە، جا بمانەوێ یا نەمانەوێ (المحاسبي) رێگەی خۆی هەبووە، لەم بارەوە لەگەڵ ئەحکامەکانی تری پەرستش دا یەك دەگرێتەوە، کەواتە وەکو لقێك لە رووبارێکدا سەیر دەکرێ، لەمەوە دەزانین سەرچاوەکان چۆن وەك یەکن!!، لەبەر ئەوە تەسەووف لەلای (المحاسبي) خۆی لەسەر دوو بنەما دەدۆزێتەوە!.

أ) موحاسەبەی دەروون (نەفس) کە لێرەدا رووبە رووی نازناوی دەبینەوە، ئەمەش لەخۆوە نەهاتووە، ساتێ نەیهێشتووە دەروونی بکەوێتە دەست ئارەزوو و خولیاکان.

ب) ئامادەگی لە پێناو سەختترین ئازار و ئەشکەنجە یاخود میحنەت بۆ خودای گەورە (بەواتا مەحبوبی یەکەم) بەم پێیە بەڵگەی وەرعی راستگۆ لەلای مەرگە و هەروا مەحەکی فەزیلەت ئارامگرتنە بۆ ئازار و ئەشکەنجەی جەرگبڕ، بەڵام دەبێ لەگەڵ ئەمانەشدا رێ و رەسمە

ئاینیەکان لەیاد بکرێت و پشت گوێ بخرێت، لە کاتێکدا ئەمەش خۆی لەوە دەدۆزێتەوە کە بە توندی هۆشیاری پەیوەندی بە ناوەوە هەیە لەوکاتەوە کەوتۆتە تاعەت و فەنا بوون و بەرە و ئیمانی پاك و بێگەرد هەنگاو دەنێ.

٢) (ابو القاسم الجنید البغدادي): قوتابی و موریدی (المحاسبي) و (السري السقطي– ٢٥٧ ك– ٨٧٠ ز) وەفاتی کردووە، و(ابي حفص الحداد– ٢٦٠ ك\ ٨٧٣ ز) وەفاتی کردووە، بووە، لە بابەت بیری تەسەووفدا کاریگەری قووڵی بەسەرەوە هەبووە و بەجۆری باسی دەکەن کە لەمەوە، بەواتا وەك مامۆستایەك تایەفەکانی تەسەووف لێوەی سەریان دەرکردووە و بە کۆمەڵگای ئیسلام دا گەشەیان کردووە، لێرەدا رووبەرووی مەعریفەی تەسەووف دەبینەوە کە نوێنەرایەتی دەکات و پێی دەناسرێتەوە و لەهەمان کات کۆمەڵێ خاسڵەتی دەست نیشان دەکات. لە (جنید)ەوە ئەو هەستە دێتەکایەوە کە بە قووڵی هەست دەکرێ بە بەرزێتی و مەزنێتی خودا و یەکتاپەرستی، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ ئیلتیزامی تەواو بە سنوری شەریعەت هەبێ، لەمەوە خاڵی دەست پێکردنی ئەزموونی تەسەووف لەو بەڵگەنامەیە دێتە ئاراوە کە خودای گەورە لەگەڵ مرۆڤ بەستووە لە قورئانی پیرۆزدا بەرلەوەی خەلق بکرێت و ئاماژە بەمە کراوە، بەلای (الجنید)ەوە ئەم بەڵگەنامەیە ئامانجی ژیانی روحی و فیکرییە کە مرۆڤ حەقیقەتی بوونی درك کردووە، وەك فیکری ئیلاهی کە پێشینەی هەیە لە خەلق کردنی زەمان، ئەمەش بە هەوڵ و تێکۆشانی خۆی نهێنی یەکتاپەرستی دەدۆزێتەوە.

(الإتحاد والحلولية): البسطامي و الحلاج:

وەك لامـان روون بـۆوە (الجنيـد) لای کردۆتـەوە بـە فیکـرەی یەکتاپەرستی و بـەهۆی فەلسـەفە و روحـەوە تـەئویلی کـردووە، بەڵام گەشە تەسەووف بەوهێڵەی لای بە فیکر کردۆتەوە بە جۆرێ هـەنگاوی هـەڵێناوە کـە خۆشەویستی ئیلاهـی هـەنگاو بە هـەنگاو بـەرە و(الإتحـاد) یـاخود (الحلـول) رۆیشـتووە، بـەواتا لای ئـەمان زیاتر پەرەی سەندووە تاکو بانگەشەی تێکەڵ بوونی روحـەکانیان کـردووە، تیایـدا یـەکیان گرتـووە و (یـەکێتی)یان پێکهـاتووە، ئەوەنـدە بـە تـەنگ پەرستشـەوە بـوون، هـەموویان بـەرەو ئاسمـان رۆیشتوون بۆ ئەوەی لە یەك گیان حەل بن.

(بایزید البسطامي) لە گونـدی(بسـطام) لـە رۆژئـاوای خوراسـان لە دایکبووە، هەر چەندە هەندێ لەسەرچاوەکان دەڵێن لە پیاوێکی هینـدی یـەوە مومارەسـەی روحـی وەرگرتـووە، بـەڵام لای ئـەم ئاشکرایە هەنگاوی گـەورەی بەرەو (فـەنا بوون لـە یەکتاپەرستی) ناوە، سەرباری ئەمانە لە تەسەووف گرفتێك بەناوی (شطحات)ەوە هاتۆتـە ئاراوە کـە تیایـدا (بسـطامي) گـەلێکی لێ نووسـیوە و بگـرە لـەلای لێکۆڵـەران بۆوەتـە جێگـەی مشـتومڕ و لێـدوانی زۆر و بۆچوونی جیـا جیـا، بـەجۆرێ لـەبارەی (شـطحات)ەکانـەوە رای وا هـەن لـە کتێبـە پـیرۆزە ئاینیەکانـەوە وەرگـیراون، بەهـەرحاڵ ئەمـە باسێکی تایبەتە و گەلێکی دەوێ، بەڵام چەمکی (یەکتاپەرستی) و (فـەنا بوون لـە یەکتاپـەرستی)دا، تێکچرژانێکە دەگاتـە رادەی لێـك جودانەبوونەوە و ئەم سنووره دەبەزێنێ، ئەمـەش رەنگـە روانگـەی تریشـی هـەبێت، چـونکە هەرچۆنێك بێـت ئێمـە لـەلامان مـەغزای

تەسەووفەکەی گرنگە و بەر لە هەر شتێ دەبێ باسی لێوە بکەین و بیخەینە روو، ئەم چەمکانەش خۆی لە پەرستشی لە رادە بەدەر دەدۆزێتەوە، ئەم پەرستشەش تا ئەو رادەیەیەی لە سنوری شەرعدا بواری پێ بدرێت، چونکە هەر هیچ نەبێت سەرچاوە کۆنەکان کاتێ باس لە عیبادەت و پەرستشی (ابا یزید البسطامي) دەکەن مرۆڤ لەبەرامبەری سەرسام دەبێت.

هەرچی (الحلاج)یشە لە دەوروبەری سالی (٢٤٤ ك\٨٥٨ ن) لە گوندی (البیضاء) لە دایك بووە و لەلای (ابي عبدالله المكي)(سالی وەفاتی: ٢٩٧ ك\ ٩٠٩ ن) و (سهل بن عبدالله التستري)(سالی وەفاتی: ٣٧٦ ك\ ٩٨٦ ن) و (ابوبكر الشبلي)(سالی وەفاتی ٣٣٤ ك\ ٩٤٥ ن) و، هەروا (ابي القاسم الجنید) خوێندوویەتی گومان لەوەنیە ئەم چوارە کەڵە پیاوانە لە بەناوبانگترین پیاوانی تەسەووفن، واش دەردەکەوێ کە (جنید) رازی کردووە (الرقعە) لەبەر بکا و نزیکەی بیست سالّ مورشیدی روحی بێت، بەلاّم لەگەڵ ئەمانەش بۆخۆی گەلێ هەوڵی بە تەنیای هەیە، ئەمەش خاسڵەتێکە پێی جودا دەکرێتەوە.

(حلاج) گەلێ جار حەجی کردووە و لەم رووە زۆر بەسەرهاتی لێ دەگێڕنەوە گوزارشت لە عیبادەت و پەرستش و روانگەی وی دەکات، بەجۆری بەردەوام ماوەتەوە لەسەر ئەم رێبازی، بەواتا بوونی حاڵەتە مەعنەوییەکانی حەج لەهەر شوێنێکدا، چونکە گۆی زەوی هەمووی هی خودایە، سەرچاوەکان وا باسی لێوە دەکەن دوای ئەوەی گەڕاوەتەوە شاری بەغدا دوورکەوتۆتەوە لە فەرزەکان، بۆ خۆشی بەڵگەی ئەوەی لەلابووە کە ئەم لە پەرستشدا هێندە هەڵکشاوە کە بە مرۆڤی ئاسایی ئەمە ناکرێت.

(حلاج) لەگەڵ (الجنيد) ناكۆكی هەبووە، بۆیە لە تەریقەت بۆ خۆی رەسمی رێگایەكی دیكەی كردووە و لەگەڵ هەموو خەڵكی تێكەڵ بووە و لەسەر سەكۆكان وەعزی داوە، بەڵام كە بۆ سێیەم جار چۆوەتە حەج گەلێ گۆڕانكاری بەسەردا هاتووە، و گرنگترین خاسڵەت تیایدا یەكێتی یە لەگەڵ خود دا وەك خۆی بانگەشەی بۆ دەكات لەگەڵ (الأنا والأنت) پەیوەستی تەواو بووە، كاتێ ئەم هەواڵەی بلاوبۆوە (علی بن فرات)(۲۹۷ ك\ ۹۰۹ ز) دەعوای شەرعی لەسەر نووسی، بەڵام دەستبەسەر نەكرا تا دوای چوار ساڵ لە وەزارەتی (علي بن عيسى) تاوانبار كرا بە بەكرێگیراوی (قرامیطة)ەكان، لەگەڵ ئەوەی لە ماوەیەكی كورت دا بەخت یاوەری بوو، سەرنجی خەلیفە و یاوەرانی بۆخۆی كێش كردبوو، بەڵام (قازی) لە دوا بڕیاردا تاوانی كوفری دایە پاڵ لە سزادانی بێ حەد كەوتنە وێزەی جەستەی سەرەرای ئەوەی جەڵدی لێدرا و لە خاچ دراو دەست و پێكانی لە جەستەی كرانەوە، پاشان سوتێنرا و فڕێدرایە رووباری دیجلە، لە كاتێكا خەلیفە تەنها بڕیاری ئەوەی دا بوو جلْدی لێ بدرێ و سەری بپەڕێندرێ.

## (غــەزالــی و ئــیبــن عــەڕەبــی):

غەزالی دوای ئەوەی بە دوای هەموو زانستەکانی سەردەمی خۆیدا گـەڕا و هەڵـە و چەشـەوایی لێ دۆزینـەوە و لـە هیچـیان دڵـی ئـاوی نەخواردەوە لە دوای ئەم گەشـە دوور و درێـژەی تەمـەنی دا ڕووی لـە تەسـەووف کـرد، تەسـەووف گەیانـدنی بە(یـەقین) ئەمـەش لـە نووسراوەکانی دا دەرکەوتووە بەم هۆیە غەزالی لە تەنگژەی فیکری و روحی دەربازی بوو، بەلایەوە ئەوانەی ڕێگـەی تەسەووفیان گرتـووە، ئەمانـە ڕێگـەی تایبـەتی خودایـان گرتۆتـە بـەر، هـەواڵیان چـاکترین هەواڵە، سەرگوزشتەیان چاکترین سەرگوزشتەیە، ڕێگـەیان ڕاسـترین ڕێگەیە، ئەخلاقیان پاکترین ئەخلاقە، هـەموو بزاوت و جوولەیـەکیان لە زاهیر و لە باتین دا لە نوری سەرچاوە وەرگیراوە.

بیروڕای غەزالی لە بابەت تەسەووف هەرگیز لـە دەرەوەی سـنووری شـەریعەت بـوونی نیـە و ڕێ بـەخۆی نـادات فـەرزە ئاییینیـەکان پشـت گوێ بخرێ و بەهیچ جۆرێ لەگـەڵ ئەوەدا نیـە کە لـە نێـوان خـالیق و مـەخلوق دا یـەکێتی هـەبێت و بەتونـدی ئەمـە بەرپـەچ دەداتـەوە، تـەوەری تەسـەووف لـەلای خـۆی لـە (فـەنا بـوون لـە یەکتاپەرسـتی- الفنـا و فی التوحیـد)دا دەدۆزێتـەوە، (الجنیـد)یش بەهـەمان شـێوە لـە تەسـەووف گەیشـتبوو، بـەواتا دان نـان بـەوەی خـودای گـەورە، بوونێکی تاك و تەنهایە و خۆی بکەری تەنهایـە، نورێکـە لـەدوای ئـەو چ نـورێکی تـر نیـە، بەلایـەوە درکردنـی ئەمـە بەرێگـەی عـەقڵ و (التجرید) نابێت، وەك چۆن فەیلەسووفە ئیلاهییـەکان بانگەشـەی بۆ دەکـەن، هـەروا (الإتحـاد والتألیـە)یـش بەرپـەچ دەداتـەوە، گـرنگترین مەسەلە لەلای غەزالی (الکشف والمشاهدة)یە.

بەلای غەزالی یەوە هێزی درکردنی مرۆڤ بە هەستەوە دەست پێ دەکا و بە عەقڵەوە کۆتایی دێت، ئەمەش هەمان لێکدانەوەی فەیلەسووفەکانی دەروونە، بەلأم پێغەمبەرەکان بە هێزێکی دیکەوە تایبەتن، ئەویش هێزی روحی پێغەمبەرایەتی پیرۆزە، کە تیایدا مەعریفەی غەیب و ئەحکامی ئاخیرەت و زەوی دەزانن.

لە بەرزترین پایەی مەعریفە لەلای غەزالی (عەقڵ) یاخود (ئیمان)نین، بەڵکو پایەی چەشتن یاخود زەوقە، کە ئەمەش خۆی لە نوری خودا دەدۆزێتەوە، کە خودای گەورە دەیخاتە دڵی ئەوانەی خۆشی دەوێن، لەبەر ئەمە ئەم نورە کلیلی گەلێ مەعریفە لە خۆ گرتووە، لەسەر بەڵگەی نووسراو و هۆ هێنانە و سەلماندی فەلسەفی نەوەستاوە، بەڵکو بەدەست هەموو ئەو کارانەن کە مرۆڤ لە ژێریەوەیەتی، ئەویش لەلایەن خودای گەورەیە.

لەمەوە عاریفەکان بەهۆی تایبەتی تایبەتیەکان، لە بوون بێجگە لە زاتیان هیچی تر نابینن، بێجگە لە خودای گەورە هی تر پەی پێ نابەن، لەبەر ئەوە هەرچی لە دوو دڵی هەیە دەسڕێتەوە و ون دەبێت و (یەقین) بە پلەی دێتە شوێنی، تا دەگات بە (فەنا بوون لە یەکتاپەرستی)دا یاخود (فەنای فەنا- فناء الفناء).

تاکو پەردەکان لادەچن و، تیایدا عاریف لە دەروونی خۆی فەنا دەبێت پاشان لەم فەنایەش فەنا دەبێت.

(محی الدین بن العربی) لە (مرسیه) لە ئەندەلوس لە ساڵی (٥٦١ ك\ ١١٦٥ ز) لە دایك بوو، گەلێ شوێنیان گەراوە لە ئەندەلووس و رۆژئاوا و رۆژهەلأتی جیهانی تاکو لە دیمەشق نیشتەجێ بووە و لەوێ لە ساڵی (٦٣٨ ك\ ١٢٤٠ ز) وەفاتی کردووە. بەزۆر لە

فەیلەسوف و سۆفییەکان کاریگەر بووە و بە دوایان گەراوە، لەوانە سەرەتا بە قوتابخانەی (إبن مسرة- مەرگی ٣١٩ ك\ ٩٣١ ن) و فەیلەسوفی سۆفی (الترمذي- مەرگی ٢٨٥ ك\ ٨٩٨ ن) و (الواسطي- مەرگی ٣٣١ ك\ ٩٤٢ ن) و (إبن العارف- مەرگی ٥٣٦ ك\ ١١٤١ ن) کاریگەر بووە، لە ساڵی (٥٩٨ ك\ ١٢٠١ ن) چووە بۆ مەککە وەك لەیەکی لە موکاشەفەکانی دا دەردەکەوێ بۆ رۆژهەڵات سەفەری کردووە، بەناوبانگترین کتێبی (الفتوحات المكية)ی نووسیوە، وەك سەرچاوەکان باسی لێوە دەکەن نووسینەکانی زیاتر لە (٨٤٦) بەرهەمن تاکو ئێستا نزیکەی(٥٥٠) بەرهەمیان گەیشتۆتە دەستمان.

رێبازی (إبن عربي) لەسەر چەمکی (وحدة الوجود)، تەوەری گرتووە، بەشێوازێ کە خاڵی دەست پێکردنی بە(وشە) هاتووە، بەلایەوە لەلای هەر پێغەمبەرێك حەقیقەتی تایبەتی هەیە کە بە(وشە) بانگەشەی بۆ دەکا، ئەمەیش روو کارێکە لە رووکارەکانی زاتی ئیلاهی، لەبەر ئەوە ئەم بانگەشانەی (وشە) گرنگی خۆی نیشان دەدا لەسەر زەوی دا.

بەلای (إبن عربي) بەولایەنەی دەتوانین درکی پێ بکەین ئەمەلایەنی (الأحدية) وەك بانگەشەی بۆکراوە، هەروەها لایەنی (الربوبية)یش دەردەکەی کە جیهان پێ دەگا لەلایەنی یەکەمدا هیچ دژ بوون و ناکۆکی و دژیەك نیە، ئەمەش واتای نوری تاك و تەنها، خێری تاك و تەنهایە، بەڵام لایەنی دووەم خۆی لە سیفاتەکانی خودای گەورە دەدۆزێتەوە، لەبەر ئەوە لەباری یەکەمدا بەزاتی خۆی (حەق)، و بە سیفەتەکانیەوە (الخلق)ە، ئەمەش دووکاری زاتی خوداین لە- یەك و زۆر، پێشینە و پاشینە،... هتد.

سەبارەت بە مرۆڤیش کە زاتی مرۆڤە، ئادەم خەلق کراوە چونکە بە (وشە)ی ئادەمی یەوە بەستراوە، و مرۆڤێکی کاملە، بەلاوە بوونی ئەو وشەیە ئادەمی یە هۆی هاتنەکایەوەی جیهانە و مانەوەمانە بە یەکەوە.

چەمکی مرۆڤ لای (إبن عربی) لەوە سەنتەری گرتووە کە چۆن (حلاج) رۆڵی مەزنی گێڕاوە لە شیکردنەوەی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودا شیکردنەوەیەکی عەقڵی یانە، لەبەر ئەوە لای (لاهوت) و (ناسوت) سروشتیان وەك یەك نیە بەڵکو دوو تایبەتمەندی و جودن، لە هەر پایەیەك لە پایەکان دەردەکەن، لاهوت رووکاری ناوەوەی مەوجوودە، بەڵام ناسوت رووکاری دەرەوەی موجودە، لە زاراوەی فەلسەفی دا یەکەمیان گەوهەرە و دووەمیان رووکار.

ئامانجی (النفس الناطقة) لای بەرزترین پلەی ئەزموونی تەسەووفە، کەواتە گەورەترین ئامانجی چەشتنە، ئەمەش خۆی لە (الوحدة الوجود) بە تەواوی دەدۆزێتەوە، کە دەروون گەیشتە ئەم حاڵەتە هۆشیاری بەخودی خۆی لە دەست دەدات، کە ئەمەش جوداوازی یە لە جیهان دا، دەگاتە قۆناغی فەنا کە زۆر ئاماژەی پێ کراوە لەلای زۆربەی کەڵە پیاوانی تەسەووف بەتایبەتی لە (الجنید)ەوە کاتێ گەیشتە ئامانجی مرۆڤایەتی و هاتنەکایەوەی و درکی بە چەشتن کرد لەمەوە لە هەموو شتدا دەگا.

ئەمەش کورتەیەکە لەو چەمکی (وحدة الوجود) کە بەڕاستی زۆری دەوێ.

# چەمکی ئازادی لە جیهانی تەسەووفدا[1]

چەمکی ئازادی ئەمڕۆ چەمکێکی فراوانە، بۆتە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ بیرکردنەوە و سیستەم و بگرە ژیانیش، لەبەر ئەوە لە زۆر ئاست و روانگەدا باسی لێوەکراوە، ناکرێ بە تەنیا لێی بڕوانین، بیرکردنەوەکانیش لەم رۆژگارەدا بەرەو ناوەوەی ئازادی هەنگاو دەنێن لە کاتێکدا کە رووبەروو دەبێتەوە لەگەڵ چەمکی واقیع و خودی واقیع، هەروا ئازادی خۆی لەودیو مەسەلەکان شاردۆتەوە لەسەرێکەوە بەردەوام پەیوەندی دەکاتەوە، ئەگەر ئاگاییمان هەبێ یا نەبێ ئازادی بۆ خۆی بوونی هەیە و ئامارژەش بەڕادەی هۆشیاری ئێمە دەدا چ لەسەر ئاستی تاکە کەس و لەسەر ئاستی کۆمەڵگادا، رەنگە باسکردنی چەمکی ئازادی گەلێکی بوێ بەتایبەتی شەپۆلە فراوانەکانی فەرهەنگ و رۆشنبیری ئەمڕۆ پێکهاتە و چەمکی نوێی لەخۆ گرتووە، باسکردنی ئازادی بەم تایبەتیە پێویستە بە بواری خۆیدا لێی بڕوا نرێ، لەبەر ئەمە لێرەدا لا دەکەینەوە بەبابەت و بوارێکی تر، ئەویش جیهانی تەسەووفە، کە ئەم سەرنجە لامان گەلاڵە دەبێ، لە ساتێکا جیهانی تەسەووف نابن بە مێژوویەکی درێژ کێشاوە و ئازادیش بۆوەتە باسێکی نوێبوونەوە، بۆوەتە روناکی ئەبەدی، بۆوەتە پێناسە بۆ مرۆڤایەتی، گەر بگەڕێینەوە بۆ مێژووی

---

[1] – ئەم بابەتە لە هەفتەنامەی (بارزان) لە ژمارە (٦٦ و ٦٧)ی ساڵی (٢٠٠٨) زایینی دا بلاْوکراوەتەوە.

تەسـەووف کـەلتوورێکی زێـڕین و گرانبـەهامان دەسـت دەکـەوێت، تەسـەووف خـۆی بـە ئـاین و کۆمـەڵگادا کێشـاوە نزیکـەی هـەزار و دووسـەد سـاڵێك لەمەوبـەر وەکـو بزاڤێك هاتۆتـە ئـاراوە، بـەر لـە هـەر شتێك لێرەدا دەبیٚ ئاماژە بەوە بکەین کە چۆن ئەولیا و کەڵەپیاوانی تەسەووف لە ئازادییان ڕوانیوە؟!، لەڕاستیدا ئەگەر بەراوردی بکـەین لەگەڵ بارودۆخی ئـەمڕۆ، هـەروا ئـەو پێشهاتانەی هـەن، دەبـیٚ یەکـە یەکە چەمکەکان وەربگرین، کە ئەمەش زۆری دەویٚ، لەبەر ئەوە باس لە چەمکی ئازادی دەکەین لە جیهانی تەسەووفدا، بۆ ئـەوەی پـەی بـە هەموو لایەنەکانی ڕوانگەی ئەولیا و پیاوچاکان ببەین، بۆ ئەوەی لەم چـەمکە بگـەین، دەبـیٚ بـزانین جیهـانی تەسـەووف چـی یـە؟!، چـونکە مـەوداکانی ئـەم جیهانـە تـەوەرەکانی ئـەم جیهانـە پێناسـە بـە ئـازادی دەدا و چەمکێکی لیٚ دروست دەکا کە لەگەڵ چەمکەکانی تر جودا بیٚ و لەسـەرێکەوە، هـەروا لەگـەڵ خـودی ئـازادی لـە تـەوەری تـردا لەسەرێکی ترەوە جوودا دەبیٚ، لەبەر ئەوەیە جیهانی تەسەووف وەك زانستێکی سەربەخۆ سەیر دەکریٚ، لەمەوە سنووری خۆی هەیە بۆیە دەتوانین بڵێین چەمکێکی یەککرتووە، یاخود فرەوانترە و زاراوەیەکی یەککرتووە، کە لێرەدا سنوورەکانمان دەست نیشان نەکردووە، لە جیهـانی تەسـەووفدا لـە کۆنـەوە سەرچـاوەکانی ئامـاژەی بـە ئـازادی کردووە، لەسەرەتادا وەکو مومارەسە پیاوچاکانی گوتـەیان لـەبارەی ئازادی هەبووە، ئینجا نوسراونەتەوە و، لەمەوە دەزانین نرخ و بەهای ئـازادی چـی یـە و لەچـی دایـە!!!، لـەلای سۆفییە گـەورەکان ئـازادی لەچـوار چـێوەی جیهـانی تەسـەووف چـۆن لێـك دەدرێتـەوە؟! چـی دەگەیەنیٚ؟! لە چ پایەیەکدایە؟! چ ئەلقەیەك پێك دێنیٚ؟!.

وەك لە كتێبە بەراییەكانی تەسەووف دا باس لە هەموو ئەو هەنگاوانە كراوە كە رێبەر دەبێ بیگرێتە بەر، ئەوا باسی تەسەووفیش هاتۆتە ناساندن، پێناسەی تەسەووف رەنگە گرفتی زۆری لەسەر نەبێ بەلاّم خودی هاتنەكایەوەو وشەكە گرفتی بەدواوە هەیە، كە وای لە توێژەران كردووە بۆ هەمان سەرچاوە بگەڕێنەوە، تەسەووف جیهانی ناوەوەیە، جیهانی ناوەوەی مرۆڤە، وەك ئاوێنەیەك نەك تەماشای خۆی بكات بەڵكو هەموو خاسڵەت و كردارە جوانەكان لە روانگە بگرێ و بە تۆزقاڵێك لە خراپە نزیك نەكەوێتەوە كە گومان هەر چوار دەوری ئەم بیرەی گرتووە خودا لە قورئاندا دەفەرمووێ:

﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾[1].

بۆ ئەوەی بگات بە دروستكەری ئەو كردارە و گوتە چاكانە، لەمەوە كەسێ خۆی ناسی بەوەوە ناسینی گەورەتر هەنگاو دەنێ، گەر لاكەینەوە بەو پێناسانەی بۆ تەسەووف كراوە و باس لە شێوەكانی بكەین بابەتێكی فراوانی دەوێ بۆیە بەگشتی لە جیهانی تەسەووف دەدوێین، شێخ (محیەدینی عەرەبی) پێی وایە تەسەووف گەیشتنە بەخودای گەورە، تەسەووف ژیانە لەگەڵ خودا و بۆ خودایە، لە خودا دا و بەهۆی خوداوەیە، پاراستنی كات و ساتە، كەوتنی تەكبیرە ترسە لە خودا تكایە لە خودا، راپێچانی خاسڵەتە ناپەسەندەكانی دەروونە، لەجێی ئەودا پڕكردنەوەیانە بە خاسڵەتە پەسەندەكان دوای هەموو ئەمانە

---

[1] – سورة الرعد، الآية ٢٨.

یەکتاپەرستی رووتە، هەرگیز دڵ شەیتان پێیان گوزەر ناکا، ئالوش و هەواو نەفس داگیر ناکەن، دڵەکان پەردەیان لەسەر لادەدرێ، هەروا بەدوتای هەموو نهێنیەکانی سۆفی دەگەڕێ، دەگا بەوەی کە هەقە، ئەوەی ناهەقە بەجێ دێڵی"[1].

هەموو ئەمانە گوزارشتن بۆ ئەوەی کە تەسەووف گرنگی بەم دونیایە نادا دەیەوێ بۆ دروستکەری ئەم جیهانە قووڵ بێتەوە، لەمەوە کە موڵك و موڵکداری دوور دەکەوێتەوە، ئەوەتا (ابو یزید) دەڵێ: سۆفییەت ئەو مندالآنەن لە حوجرەی هەق دا[2]، لەبەر ئەوەی جیهانی تەسەووف جیهانێکە ئەگەر کەسێ بیەوێ بە تەواوی لێی تێ بگات، ئەبێ خۆی بێتە گەشتکەر و گەڕۆکی ئەو جیهانە، وەکو هەموو جیهان و زانیارییێکی نەناسراوی تر... بەلآم هێشتا ناسینی جیهانی تەسەووف لە زانیاریەکانی تریش نەناسراو و داپۆشراوترە، بۆچی؟! چونکە تەسەووف هەم دینە و هەم چەشتن، هەم... تابشێ نوری هەقە بۆسەر دەروون واتە (ئیشراق)...، وە هەم مەقام و ئەحواڵە.

مەقام هەروەکو پایە و پلەی ئیشی دنیایی وایە، وەکو بڵێین فیسار کەس، مودیرە یان مولاحیزە، واتە خەلآتێکی دەوامدارتری خوداوەندییە کە لەرێگەی خواپەرستی و زیکر و پارێزگاری(تەقوا) وە بۆ سۆفییەکان دەست دەدات، بەلآم حاڵ هەرچەن ئەویش هەر شتێکە لەم بابەتە، بەلآم بەردەوام نیە، واتە گۆڕان لە حاڵێکەوە بۆ

---

١ – الفتوحات المكية، للشيخ محي الدين بن عربي، ص٥٢٠، ج ١.

٢ – التعرف المذهب اهل التصوف، الإمام ابوبكر محمد الكلاباذي، ص١١٠، مصر، ط١٩٦٩م.

حاڵێ زوو زوو دەست ئەدات و بگرە چەند جاریش هەر ئەو حاڵە بڕوات و بگەڕێتەوە، بەڵام مەقام دامەزراوە کە گۆڕانیش بۆلای سەروترە وە ئەروات، سا مەگەر خوانەخواستە کارێکی ناپەسەندی لێ رووبدات، وە ئەو پلە و پایەی لە دەست بدات[1].

جیهانی تەسەووف لادانی هەموو ئەو گەردوو خەوشانەیە کە دەوری دڵیان گرتووە، ئەمانەش ئاکاری ناپەسەندن ئەم ئاکارانەش لە قورئانی پیرۆزدا ئامارەیان پێ کراوە و بەهەمان شێوەش ئامارە بۆ کارە پەسەندەکان کراوە، کەواتە جیهانی تەسەووف بریتی یە لە پاکبوونەوەی دەروون لە گومان و پاشان دەورەدانی بە گومان بۆ پاراستنی ناوەرۆکەکەی هەر کەسێ بڕیار بدات و بە جیهانی تەسەووف شادبێ دەبێ بە (مەقام)دا بڕوات بە ڕێنمایی پیاوچاکیە کە مەقامەکانی لەبارەی ژمارەیانەوە بە تەواوی دەست نیشان نەکراوە سەرەتای مەقامیش بە گشتی بە مەقامی (تەوبە) دەست پێدەکا، مرۆ یەکەم هەنگاو دەنێ بەرە و جیهانی ڕۆح، دوورکەوتنەوە لەو مەسەلە و شتانەی گومان دروست دەکەن، لێرەدا هەرگیز گومان لە ناواخن نامێنێ، سۆفییەکان ناویان لێ نراوە پاك (صفا) بێ گەرد و خەوش، ناویان لێ نراوە پێشەوا، ئەمانەش لەوەوە هاتووە کە لە ناخیان ئامێرێك دروست بووە چاودێریان دەکا و نەوەك ئامێرێك دروست بێ بۆ ئەوەی مەرام و بەرژەوەندییەکان بەدەست بێنێ لەمەوە جیهانێك خاڵی یەکلاکەرەوەی دەست نیشانیکا و بەرەو ڕۆح هەنگاو بنێ دەبێ چۆن تەماشای ئازادی بکات!!! چەمکی ئازادی بۆ کەسێکی

---

١ – تەسەووف چی یە ؟ ل٧٩.

ئازاد رێك پێچەوانەی كۆیلەیە، ئازادی پێچەوانەی كۆیلایەتی یە، لە قورئانیش دا هاتووە، خودای گەورە دەفەرمووێ:

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَى ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ﴾[1].

كەڵە پیاوانی سۆفیزم بەجۆرێك لە ئازادی دەڕوانن، دەتوانین بڵێین سێ ڕوانگەی لە خۆگرتووە:

١) ئازادی بەسەر سەراپا جەستەی تەسەووف دابەش دەبێ.

٢) ئازادی وەكو مەقامێكی تایبەتی.

٣) ئازادی و (عبودییەت).

لێكجودا كردنەوەی چەمكی ئازادی لە هەناوی تەسەووف خۆی دا سەرچاوەی گرتووە، لەمەوە دەتوانین ئاماژە بەوە بدەین تەسەووف و جیهانەكەی دوای ئەو سنوورە بەرفراوانەی هەیەتی لەناوەخۆیدا لە بابەت دابەشكردنەوە گرنگی بەخۆنەداوە، لەبەر ئەوەشە ژمارەی مەقام و حاڵەكان نەك لە تەریقەتێكەوە بۆ تەریقەتێك بگرە لە پیاوچاكێك بۆ پیاوچاكێكی تر دەگۆڕێت، دیسان چەمكەكان دابەش دەبنەوە، تا ئەوەندەی دەكرێت گۆڕانكارییان بەسەردا بكرێت، واتا تەنیا كار لەسەر بگۆڕەكانی چەمكەكانی دەكرێت، كار لەسەر ئەو نەخشەیە دەكرێت كە لە توانای دا هەیە بگۆڕێت، چەمكی ئازادیش بەهەمان جۆر دەكەوێتە بواری جیهانی تەسەووف.

---

[1] – سورة البقرة، الآیة ١٧٨.

۱) ئازادی بەسەر سەرا پا جەستەی تەسەووف دابەش دەبێ:

جیهانی تەسەووف جیهانێکە یەك روانگەی نیە، بەڵام لە دوا ئامانج و ئەنجام دەیەوێ سەرنجێکی گشتی دروست بکا، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە جیهانی تەسەووف بەرە و یەکتاپەرستی هەنگاو دەنێ، بۆیە وەکو گشتگیر سەیر دەکرێت، وەکو یەك قەوارە سەیر دەکرێت، کەواتە جیهانی تەسەووف جیهانێکی یەکگرتووە، ئێمە دەزانین بۆ ریکخستنی کاروباری ئەمڕۆ و سبەی کاروباری دونیا و ئاخیرەت شەریعەت دانراوە و کار بە بنەماکانی دەکرێت، جیهانی تەسەووف یەکەم هەنگاوی لە شەریعەتەوە دەنێ، بەڵام بەشێوەیەکی ئاسۆیی نەوەك ستوونی، دەیەوێ بگات بە هەقیقەت، ئەم ئاسۆییەش سێ قۆناغ دەگرێتە خۆی:

۱) شەریعەت.
۲) تەریقەت.
۳) حەقیقەت.

کەواتە جیهانی تەسەووف لەسەر بنەمایەکی راست و دروستەوە هەڵنراوە، سەرەتای هاتنە نێو ئەم جیهانە بە مەقامی(تەوبە) دەست پێ دەکا و بەرەو مەقامەکانی تر هەڵدەکشێ، کەواتە مرۆڤ لە هەموو کارو کردەوەیەك لە هەموو شتێ تەوبە دەکا تەنیا لادەکاتەوە بە خودای گەورە، مرۆڤ لە دەروونی خۆشی تەوبە دەکا[۱]، کەواتە لێرەدا وەرچەرخان دەست پێ دەکا ئەو خاڵەیە مرۆڤ بەرەو ئازادی هەنگاو دەنێ

---

۱ - معجم الفاظ الصوفية، حسن الشرقاوي، ص۸۸، القاهرة ۱۹۸۷.

بەرپرسیارێتی لە بابەت دونیاوە لەسەر شان لادەچێ جا بیەوێ یا نەیەوێ لەلایەکی ترەوە بەرپرسیارێتی ئاخیرەت و مەلەکردن لە جیهانی روحی دێتە سەرشان، لە یەکەم هەنگاودا نە تەنیا بیروبۆچوونی بگرە خودی جەستەی دەکاتە قوربانی ئەم رێگایە.

(بشر الحافی) یەکێکە لە سۆفییە گەورەکان دەڵێ: خودا بە ئازادی خەلقی کردووی، وەك ئەوەبە کە خەلقی کردووی[1].

ئەو پێی وایە نابێ کەسێ بۆ سەفەر لەگەڵ خۆت ببەی، بێگومان مەبەستی لەسەفەر کارکردنە بەرەو خودا، تۆ هەر چەندە لە گوند و شاردا خزم و کەسانت دەبینی، بەڵام خۆت بەرپرسیاری لە ئازادی خۆت، بەرپرسیاری لەوەی مەسەلە دونیاییەکان کۆیلەت دەکەن، بۆیە دەبێ لە خەڵك دوور کەویتەوە، بەو پێیەی تەسەووف جیهانێکی بێ کۆتاییە بەهەمان شێوە ئازادیش جیهانێکی بێ کۆتاییە، وە نەبێ هەردووکیان یەك شت بن، بەڵام لە بوارێکدا پێك دەگەنەوە، سەرەتای تەسەووف (تەوبە)یە، لەوێوە ئازادی راستەقینە دەست پێدەکات مرۆڤی خاڵی یەکلاکەرەوە دادەنێ، بۆ ئەوەی چ شتێکی موڵکی حەقیقی یە و چ شتێکی موڵکی ساختەیە، لەبەر ئەوە مرۆڤ بەرەو مرۆڤ بەرەو دروستکەری موڵکەکان هەنگاو دەنێ، لەم ساتەوە ئازاد دەبێ، نابێتە کۆیلەی موڵکەکان جا چ موڵکی مەعنەوی یاخود موڵکی مادی بێت، کە سەرەتای تەسەووف بە (تەوبە) دەستی پێکرد بەرەو جیهانێکی

---

١ – اللمع، الإمام ابو نصر السراج الطوسي، ص٣٧٢، لجنة نشر التراث الصوفي، مصر.

بەردەوام لە کرانەوە هەنگاو دەنیٚ و مەقامەکانی تر دەست پیٚ دەکا، سۆفی ریٚبەر شتەکانی نەك تەنیا بزانیٚ یا ببینیٚ بەڵکو تامیان دەکا و لەزەتیان لیٚ وەردەگریٚت، لەبەر ئەوە تەنیا زانین و تەنیا بینینی جیهانی کۆیلەکانە، ئەوەی ئازادە دەبیٚ تامی کردبیٚ، لەمەوە مەقامەکانی تر دەست پیٚ دەکات کە دەمیٚکە ریٚبەری ئەم ریٚگایە بڕیاری داوە لە دەریای ئازادی مەلە بکات، لەلایەکی ترەوە ئەوەی گوزارشت لەم ریٚگایە دەکا پاککردنەوەی دڵ و دەروونە، ئەرزش و بەها دانە نانە بۆ جەستە، چونکە جەستە دەتکاتە کۆیلەی زۆر شت لە دەرەوەی خۆی، جەستە دەتکاتە کۆیلەی خواردن، کۆیلەی ئالۆش و هەواو نەفس، کۆیلەی دونیا، بەڵام رۆح ئازادە نازانیٚ هەوا و نەفس و دونیا و خواردن چیە، رۆح جیهانیٚکی پاکە، دوور لە خەوش و گێلی و نەفامی بەسەر هەموو جیهان تەی دەکا، پیٚناسەی خۆی بۆ چاو و دڵ و دەروون و هەناسە و دەست هەیە، گیان بە هەموو شتەکان دەدا، رووی حەقیقەتی هەموویان دەناسیٚنیٚ، بەهای شتەکان وەك خۆیان دەست نیشان دەکا، رۆحە دەتوانیٚ هەر سیٚ ئەلقەی گرنگی شەریعەت، تەریقەت، حەقیقەت، بە یەکەوە گریٚ بدا، کە رۆحیش هاو واتای ئازادییە، ئەوەتا (أبا علي الدقاق)ی گەورە سۆفی دەڵیٚ: ئەوەی هاتۆتە دنیا و لیٚی ئازاد بوو، بەرەو ئاخیرەت کۆچ دەکات و لیٚی ئازادە[1].

---

١ - الرسالة القشيرية، ص١٧١.

کەواتە ئازادی لە سەنتەردا بوونی هەیە، لەوێدا دەست بەکار دەکات، سەنتەریش هەرگیز بوونی خۆی لە دەست نادات چونکە لە کرۆکدا بە جیهانێکی چەسپاو دادەنرێت و بگرە لەمەوە بزاوت و گۆڕانەکان دەست پێ دەکەن.

ئازادی بەلای هەندێ لە سۆفیەکان رێبەری تەریقەت گوزارشت لە دوای ئەنجامی رێگای تەریقەت دەکا کە رێبەر بەرەو خودا دەیگرێتە بەر، کە ئەمەش کۆتاییە بۆ بەدەست هێنانی عبودیەت، ئینجا رێبەر دەگا بەوەی کە کۆیلەی راستگۆی خودایە، دڵسۆزە لە تاعەت کردنی، بە هەموو گیانی خۆی دەبەخشێ، بەوەی داینا و روو دەدا ئارامە، بەوەی خودا دەیداتێ رازییە[1]. گومان لەمە نیە لێرەدا نەك یەك مەقام بەتایبەتی یاخود بە پێچەوانەی ئازادی (عبودیەت) رووبە روومان دەبێتەوە، بەڵکو لەبەردەم سەراپا جەستەی تەسەووف داین، کە خودی(عبودیەت) و (توکل) و (راضي) و (إخلاص) و (صادق) و هتد، مەقامەکان پێکدێنن، بەم جۆرە ئەگەر ئازادی بەلای رێبەرەوە دوا ئەنجام بێت، بێگومان هەر لەسەرەتاوە وەك هێڵێکی مەزن تەی کردووە و بەرەو حەقیقەت هەنگاو ناوە، دەبێ ئەوەش بزانین سۆفی کاتێ ئازادە تەواوی ژیانی بە ئازادیەوە گرێ دەدا، ئەمەش وای لێ دەکات روانگە بۆ ژیان چ ئەمڕۆ یا بەیانی هاوشێوە بێت، بۆیە دونیا و ئاخیرەت بە ئازادییەوە بە یەکتریانەوە دەبەستێتەوە، بوونی ئێمە هەر لەسەرەتاوە تاکو مەرگ بە ئازادیەوە دەبەستێتەوە، ئازادی کە بەسەر سەراپا جەستەی تەسەووف دابەش دەبێ تایبەت نابێ بە کۆمەڵێ

---

[1] – معجم الفاظ الصوفية، ص١٢١.

دیاریکراو، یاخود بە مەقامێك كە زیاتر خۆی لە قۆناغێك لە قۆناغەكان دەنوێنێ، چونكە ئازادی وەك هێڵێك لە تەك هەموو مەقام و حاڵەتەكان مەوجوود دەبێ، بوونی زوهد و تەرككردنی دونیا دەرگایەكی دیكە بۆ دەكاتەوە، بەم هۆیەوە حەقیقەتی ئازادی بۆ بەدەر دەكەوێ.

بەم پێیەی تەسەووف لە دونیادا بۆ مرۆڤی هەژارە، هەژار لە ماڵ و موڵك و سامان، لەمەوە ئازادی لە راژەی هەژارەكان دایە، چونكە كەسێ كە تالیب بێ دەبێ لە خزمەتی دابێ"[1].

بێگومان لەمەوە ئەوە دەسكەنە دەكەین كە ئازادترین كەس گەورەیانە، دەبێ لە خزمەتی هەژارەكان دابێ، ئەوانەی بڕیاریان داوە هەژاربن، بەم هۆیەوە ئازادی دەبێتە بەرهەمهێنەری ئازادی تر، جیهانی تەسەووف ئەم ئامارەیە دەدا كەبێ پایان سنووری ئازادی فرەوانتر بكا، جیهانێك نەبێتە كۆیلە، كۆیلەی ئەوانەی رۆح دەخەنە قەفەز و لە ناوەرۆكی خۆی دایدە ماڵن.

(یحیی بن معاذ) دەڵێ: رۆڵەكانی دونیا پێشەوا و ئیمام و كۆیلەكانی خزمەتیان دەكەن و رۆڵەكانی ئاخیرەت ئازادیخوازان و لە فەرمان دەرنەچووان خزمەتیان دەكەن[2].

لێرەوە دەبێ بزانین دوو ئاراستە بەدی دەكرێت، رۆڵەكانی دونیا ئەوانەی كورت بینن و ئامانجیان لە خۆیان تێپەر ناكات، رۆڵەكانی ئاخیرەت ئەوانەی ئامانجیان بر دەكات و ئامانجیان ئاراستەیەكی وورد و دوور لە خۆ دەگرێ، ئەم دوو ئاراستەیە دوو

---

١ – الرسالة القشيرية، ص١٧٢.

٢ – الرسالة القشيرية، ص١٧٢.

کەسایەتی بەرهەم دەهێنێ یەکێکیان خزمەت دەکرێ، یەکێکی تریان خۆی خزمەتی خۆی دەکات، هەروەها ئەم دوو کەسایەتیە یەکیان خاوەنی خۆی نیە و کەسایەتی تریان خاوەنی خۆیەتی، کەواتە لە ئاراستەی یەکەمدا دەبێ جودا بکەینەوە ئەوەی خزمەت دەکرێ دەبێ خاوەنی کەسایەتی خۆی بێ، لەبەر ئەوە دەبینین، کەسایەتیەکان خەسڵەت و مۆرکی خۆیان لەدەست دەدەن، پێشەوا رەنگە لەم شێوەدا خزمەت بکا، بەلاْم لە ناوەرۆکدا دەبێ خزمەت بکرێ، ئەم ناکۆکییانە جیهانی تەسەووف وەکو رەخنە ئاراستەی رۆڵەکانی دونیای دەکا و خاڵی جوداکەرەوە دادەنێت لە نێوان رۆڵەکانی دونیا و رۆڵەکانی ئاخیرەت، لەبەر ئەوە ئازادی خوازان خاوەن پایەکانن، ئەهلی حەقن[1] لە دژی ناکۆکیەکان کاردەکەن، رۆڵەکانی ئاخیرەت ئازادیخوازان خزمەتیان دەکەن، بەجۆرێ هەموو مرۆڤ لەبەرامبەر هەوڵی خۆی دا بەرپرسیارە، ئەگینا لە هەموو ماف و ئەرکەکانی تردا لەگەڵ هەموو مرۆڤەکان یەکسانە، ئەم چەمکەش خودی (تەقوا) گوزارشتی لێ دەکا، چەمکی ئازادی بەوپێیە دەکشێ لەکاتی بریاردانەوە تاکو کۆتاییەکی نادیار، ئەمەش مەلەکردنە لە جیهانی رۆحدا، لە راستیدا کۆتایی نادیار بۆ گەیشتن بە خودایە، (إبراهیم بن أدهم) دەڵێ: پیاوی ئازادی بەرێزە لە دونیا دەچێتە دەر بەرلەوەی دونیا لەو بچێتە دەر[2]، تەسەووف فەلسەفەیەکە لەسەر خود بنیات نراوە، بەواتا زەمینەی بنیاتنانی خودی مرۆڤە، خودی مرۆڤ پانتاییەکی فرەوانە، لەبەر ئەوە لە هەر هاوکێشەیەکدا دەبێت

---

١ – الرسالة القشيرية، ص١٧٢.

٢ – معجم الفاظ الصوفية، ص١٢٢. يان الرسالة القشيرية، ص١٧٢.

کرۆکی خودی مرۆڤ بپارێزرێت، لەبەر ئەوە هەموو ئەو مەسەلانەی کرۆکی خوودی مرۆڤ ون دەکەن، دەبنە رێگر لەبەردەم ئازادی دا، ئازادی بەسەر خودی مرۆڤ دا بەشدەبێ، نەوەك هەوڵ بدات وەکو سیستەمی باری کۆمەڵایەتی رێك بخا، ئازادی بۆ هەموو خودەکان وەك یەك وایە (إبراهیم بن أدهم) دەڵێ: هاورێیەتی کەسێ مەکە مەگەر ئازادبێ، تەنیا ببیستێ نەوەك هەر قسە بکا[1]، دەبێ لێرەدا وردبین کە مەبەست لە قسەکردن، قسەکردنی زۆرە، هەڵەی بەردەوام و لە ئەنجام دا گرفت دروست دەکا، کەوا قسەکەری زۆر باری خەڵکی قورس دەکا، ئەمەش پێچەوانەی رەوشتی سۆفیەکانە، چونکە دەیانەوێ لەسەر خودی خۆیان هەموو شتێ وازی بکەن، تا ئەو رادەیەی خودیان لە دونیا دەردەچێ، بۆئەوەی تێکەڵ بە حەقیقەت بێ، ئەمەش وەکو قۆناغێ، یاخود وەکو وەرچەرخانێك تەنیا ئازادی لە توانای دا هەیە، خودی مرۆڤ لە مەسەلە دونیاییەکان پاگژ بکاتەوە، قەوارە هەنگاو بنێ و لە دوا ئەنجام دا بێتە یەك قەوارە.

وەك ئاماژەمان پێدا هەر لە یەکەم مەقامەوە مەقامی(تەوبە) تاکو یەك قەوارە و لە حەقیقەت کە خود گوزەری پێدا دەکات، ئازادی بوونی هەیە، لەبەر ئەوە ئەو پیاوانەی خودیان پاگژ کردۆتەوە، پێیان دەگوترێت ئازادیخوازان، ئەوانە خاوەن پایە و مەقامن، بەمانە دەگوترێ پیاوی شەو، ئەهلی هەق و ئەهلی حەقیقەت، بەمانە دەگووترێت ئەهلی ئیخلاس، هەروەها پێیان دەگوترێ عارفەکان، ئەوانەی بەخودا عارفن[2].

---

١ – الرسالة القشيرية، ص١٧٢.

٢ – معجم الفاظ الصوفية، ص١٢٢.

ئازادی تەریب لەگەڵ یەکەکانی سەراپا جەستەی جیهانی تەسەووف دەکشێ، چونکە هەموو مەقامەکان برێك لەم گوزارشتانە لە خۆ دەگرن، چ وەکو پەیوەندی وەکو مانەوە.

**٢) ئازادی وەکو مەقامێکی تایبەتی:**

گەر بمانەوێت وەکو مەقامێك باس لە ئازادی بکەین، پێویستمان بە ناساندنی (مقام) هەیە، بۆیە بەپێی دابی سۆفیەکان بە پلە وپایەی بەندە بەلای خواوە، ئەڵێن مەقام، بێگومان مەقام لە ڕێگەی خواپەرستێکی ڕاستەقینەی بەردەوامەوە و خەبات لە دژی نەفس (المجاهدة مع النفس) و وەرزاندنی نەفس(رياضة النفس) دەستی بەندە ئەکەوێت[1]، هەن ژمارەی مەقامەکانیان کردووە بە (دە) مەقام، بەواتا (دە) پلە لەبەر ئەوە هەن ژمارەیان زیاترە یاخود ناوەکانیان پاش و پێش خراون، لەبەر ئەوە هەر مەقامێك بەرامبەر قەناعەتی خۆی هەیە، کە دەبێ ئەو پلەو پایە ببڕێ ئەگینا ناگاتە تەسلیم، مەقام لەلای سۆفیەکان لە قورئانەوە سەرچاوەی گرتووە ئەوەتا خوای گەورە بە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ:

﴿ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴾[2].

لەبەر ئەوە (مقامی محمود) بەرزترین شوێنە لە بەهەشتدا، هەروەها لە قورئانی پیرۆزدا وەکو پلە و ژمارەش هاتووە، بەمە مەقام بەو چۆنیەتیە دەڵێن کە بەندەی خودا، بەهۆی بڕیاری

---

٢ – تەسەووف چی یە ؟ ل ١٩٣٧ (١٩٣).

٣ – سورة الإسراء، الآية ٧٩.

خۆیەوە قۆناغەکان دەبڕێ و پێی دەبەخشرێ کە دەبێ یەکەم مەقام (تەوبە) بێ و هیچ گرفت لەسەر ئەمە نیە، ئینجا مەقامەکانی تر دەست پێ دەکا وەکو (توکل) و(رضا) و(وەرع) و(زوهد) و(قەناعەت) و(سەبر) و(خەوف) و(ڕەجا) و(صدق) و(شکر) و(موحاسەبە) و(تەسلیم) و هتد، پرسیاری گرنگ ئەوەیە ئایا ئازادی وەکو مەقامێك سەیر دەکرێت؟!، لە راستیدا ئەم پرسیارە دەمانخاتە بەردەم مەسەلەیەکی تر، ئەویش ئەوەیە لەلایەکەوە لەبەر گرفتی ژمارەی مەقامەکان و هەروا بوونی حاڵەکان و زاراوەکان لەلایەکی تر دەتوانین ناوەڕۆکی ئازادی دەست نیشان بکەین، سەرچاوە کۆنەکان لە باسێکی تایبەتی ئازادیان خستۆتە روو، وەکو بەندە نابێ لە ژێر کۆیلەی ئەوانەی خەلق کراون، بوونەوەرەکان دابێ و دەبێ پشت لە گشت بکا، روو لەوە بکا کە گشت هی ئەوە و دڵت بێجگە لە خودا گەورە چی تری لێ نەبێ بۆیە نابێ دەسەلاتی شتەکان بەسەری دا زاڵ بێ و هەڵیسوڕێنی[1]، بۆیە دەبێ لە دڵی دا جیاوازی شتەکان هەڵگرێ و وەك یەك سەیریان بکا، کەواتە لێرەدا وەکو مەقامەکانی تر، رێبەر دەبێ ئەم قۆناغە ببڕێ لێرەدا ئازادی وەکو بەخشین وەکو راستگۆیی وە رەزامەندی و تەسلیم سەیر دەکرێ، بەلام ئەمە مانای ئەوە نیە کە ئەو مەغزایە لە دەست بدا کە وەکو هێڵێکی کشاوە لە دیو سەراپا جەستەوە سەیر نەکرێت، بەلام کاتێ کە ئامارەکانی دەست نیشان دەکرێت، لەو حاڵەتەدا دەبێت هەر

---

١ – الرسالة القشيرية، ص١٧٠.

دووبار چ رووالّەت و چ ناخ کەواتە لە یەکێك لە قۆناغەکان ئازادی دەردەکەوێ سەراپا خودی ڕێبەر دەگرێ، هەموو شتێك دەبێتە ئازادی چ ناوەڕۆك چ شێوە، لەمەوە ئازادی دەبێتە قەوارەیەکی مەزن، لەمەوە (الشبلی) دەڵێ: مەقامی ئازادی ئازیزە[1].

سۆفیە گەورەکان ڕێزیان لە ئازادی ناوە، کە بەر لە هەر شتێ ئازادی بە ڕۆحیان دەبەخشێ، ئازادی لەسەر زەمینەی خود ساز دەبێ، بۆ ئەوەی بگات بە تاکە حەقیقەتێك کە نهێنی ترین نهێنی ترینە.

ئازادی وەکو مەقامێك هەر چەندە زۆر باس نەکراوە بەلاّم لە جیهانی تەسەووفدا ناتوانین لێی نەدوێین، ڕەنگە لەم ڕووەوە مەبەستی تریش هەبێت چونکە دوا ئەنجامیش کە هاتۆتە باس کردن، هەمان ئەو مەبەستەی هەبێت کە دوا مەقام بێت، کەواتە هەوڵدان بۆ ئازادی لێرەوە ئاستێکی بەرزی دەوێت و ئازادی لە حەقیقەت نزیکتر دەبێتەوە، وەك ئەوەی لەناو خۆی دا راڤە بکرێت، دەشێت دوا مەقام ئازادی بێت، ئەوەتا (جنید البغدادي) دەڵێت: دوا مەقامی عاریف ئازادی یە[2]، هەرچەندە جیاوازی لە نێوان (زاهید و عابید و عاریف) دا هەیە بەلاّم لێرەدا هەمان مەبەستی سۆفی بەدەستەوە دەدات، کەسێ دەیەوێ دڵ و دەروونی روونبکاتەوە، هەقیقەت لە دەروونیا بدرەوشێتەوە، دەیەوێ دەروونی بەچاوی پەیوەست بکا لە پێناو (بەصیرەت) کە چاوی دەروونی پێ

---

١ - الرسالة القشيرية، ص١٧١.

٢ - اللمع، ص٣٨٩.

دەگوترێت، دەیەوێ لە پێناو حەقیقەت پشت لە خودی خۆشی بکا لە دوا ئەنجامدا، ئازادی بۆ دەمێنێتەوە کە هیچ گرنگی بەخودی خۆشی نادات، لەگەڵ ئەوەی لەسەر زەمینەی خودی دا سازی کردووە، نهێنیەکانیش دوا جار بەم شێوەیە بە ئەنجام دەگەن.

کەواتە دوور کەوتنەوە لە خود هەمان پەیامی بڕیاردانی سەرەتایە لە پێناو ئازادی و حەقیقەتدا، ئەمەش ئەو پەڕی دڵسۆزی رێبەر نیشان دەدات، چونکە رۆح بەزمانی خۆی دەدوێ، دڵ بە زمانی خۆی دەدوێ، لە جیهانی تەسەووفدا بەهۆی ئازادییەوە دڵ، چاو، رۆح بۆخۆیان دێنە ئاخاوتن، بەبێ ئەوەی پەیوەندییەك هەبێ، کە بەهۆی جەستەوە بگوازرێتەوە، هەموویان چ دڵ چ چاو چ رۆح چ دەروون هتد، بۆ خۆیان دەبنە نوێنەری خۆیان، بۆخۆیان دەبینن، بۆخۆیان دەبیستن بەم جۆرە گوزارشتەکان دێنە ئاراوە و ئازادی وەکو (زاهیر و باتن) دەردەکەوێ.

هەر چۆنێك ئەو بێ بیرانە زاڵن کە ئازادی بەسەراپای جەستەی تەسەووف دەبەستێتەوە، چونکە ئاماژەی تریش هەن، کە مرۆڤ بەرەو ئازادی دەبەن، لە هەمان کاتدا ناو دەنرێن بۆ ئەوەی کە دەبنە کۆیلەی حەقیقەت، مرۆڤ بەهۆی زوهدەوە ئازاد دەبێ لە ماڵ و موڵك و سامان، ناخی بۆ ساتێکی ئەبەدی پشوو دەدات، چەمکی ئازادی وەکو مەقامێکی تایبەتی دەزانین لە دواییەکانە، بەلاّم مۆرك و خەسڵەتی زیاتر بلاّو دەبێتەوە، ئەم سەرنجەش بەرەو مەیدانی ترمان دەبەن، کە لە مەقامەکان دا بەبێ ئازادی گوزەر ناکەین، ئازادی (یەقین)مان پێ دەدا، خودی خۆمان دەناسێنێ، پاشان بەرەو حەقیقەتمان دەبا، حەقیقەت و خودمان

دەكاتە يەك قەوارە، گومان لەوە نییە رێبەرانی تەسەووف بە بایەخەوە لە ئازادییان روانیوە، چونکە ئازادی زامنکەرە لە پێناو گەیشتن بە حەقیقەت، بۆ ئەوەی جەستە لە تاریکی رزگاری بێ، بۆئەوەی دڵ و دەروون هەمووی ببنە نووری حەقیقەت.

## ٣) ئازادی و (عبودیەت):

بەلای پیاوانی تەسەووفەوە ئازادی پێچەوانەی کۆیلەیەتیە، بەڵام دەبێ بزانین ئایا چ جۆرە کۆیلەیەتیەك؟ بەلای ئەوانەوە ئەو خودەی ببێتە کۆیلەی هەواو نەفس و شەیتان و هتد، ئەوا دەسەڵاتی ون دەکات و لەجێی دەسەڵاتی خۆی هێزە بەدەکان بەرێوەی دەبەن، لەلایەکی تریشەوە ئەوەی دەمانخاتە پرسیارەوە و ئەوە یەکە هەمدیس لە مەقامەکان، مەقامێك بەناوی (عبودیەت)ەوە هەیە، لەبەر ئەوە لێکچوونێك لە نێوان چەمکەکان هەیە، چونکە پیاوانی تەسەووف پێیان وایە ئازادی چەمکێکی موجەررەد نییە، بەڵکو چەمکێکە لە زۆرەوە لە کەرتبوونەوە بۆ گشت بۆیەك قەوارە دەکێشێ.

مەقامی عوبودیەت چەمکێکی سلبی نیە و چەمکێکی ئیجابیە، چونکە عوبودیەت واتە بەندەیی، کۆیلەیی، غولامی، لە روانگەی تەسەووفەوە مەقامی گەورە پیاوان و ئەولیاکانە، بەجۆرێ تەنها هەر موسڵمان بوون و باوەرهێنان نییە، گرتنەبەری رێگەی بەندەییە بەوجۆرەی کە خوا پێی خۆشە، لە قورئانی پیرۆزدا بە دوو وشە زیاتر ناوی هاتووە وەکو (عەبد، عیباد، عابد، ئەعبود، نەعبود هتد)[١].

---

١ – تەصەووف چی یە ؟ ل٢٨٩.

مەقامی عوبودیەت پەیوەندیەکی قووڵی لەگەڵ ئازادی هەیە، بۆخۆشی گەلێکی لە بابەت نووسراوە چونکە عوبودییەت تەواوترە لە عیبادەت[1].

لەمەوە ڕێبەرانی تەسەووف مەقامی عوبودیەت دەکەن بە پلە کە خۆی لە:

١) عیبادەت.

٢) عبودیەت.

٣) عوبودە.

دەنوێنێ، چونکە لە پلەی یەکەمدا عیبادەت کاری هەموو موسڵمانێکی سادەیە، تێکڕای موسڵمانەکان خەریکی عیبادەتن، کەچی پلەی دووەم عوبودیەت هی هەڵبژێردراوانە، بەلاّم پلەی سێیەم عوبودە پلەی تایبەتمەندانە، ئەوانەی خواناسن لەناو هەڵبژێردراوەکاندا هەڵبژێردراون، لەبەر ئەوە ئەم سێ پلەیە سێ مەعریفەی دیکە دەوروژێنێ وەکو:

١) عیبادەت علم الیقین.

٢) عوبودیەت عین الیقین.

٣) عوبودە حق الیقین.

کەواتە مەقامی عوبودییەت بەمجۆرە دابەش دەکرێ کە ئەوانەی عیبادەتی سادە دەکەن، دڵیان بەهۆی ئەو مومارەسەوە هەر جێگەی (علم الیقین) دەبێتەوە، بەواتا یەقینیان تێکەلاّوە بەگومان، چونکە بەڵگەیان نیە بۆ سەلماندنی، هەر تەنها زانیاریان هەیە، کەچی

---

[1] – الرسالة القشيرية، ص ١٧١.

ئەوانـەی لـە پلـەی دووەمـن، دەگەنـە عـین الـیقین بـەجۆرێ شـتەکان دەبینن، واتا لە زانیاری هەستی تێیەری کردووە، بەڵام ئەمە بەس نیە، لەبەر ئەوە ئەوانەی لە (عبودە)دان گەیشتونەتە (حق الیقین) بـەهیچ کلۆجێـك گومـان وجـودی نیـە، شـتەکان خۆیـان دەدوێـن، حەقیقەت لەناویدا تام دەکرێ و دوا قۆناغی بریوە، بەڵام ئایا ئەم مەقامەش هەر گوزارشتە لە ئازادی؟ بێگومـان لـە رۆژی ئـەمرۆدا چەمکەکان دەبێ لایەنی ئیجابی و سەلبیان ئامارژە پێبدرێ، چونکە مەقامی عوبودیەت ئەڵقەیەکی تەسەووفە، هەروەها بەم هۆیەوە وەکو هێڵی ئازادی پێیدا گوزەر دەکات و بگرە پیاوانی تەسەووف زیاتر لەمە ئەم دوو چەمکە بەیەکەوە دەبەستنەوە، ئەوەتا (أبا علی الدقاق) دەڵێ: حەقیقـەتی ئـازادی لـە تـەواو بـوونی عبودیـەت دایـە، ئەگـەر خودای گەورە عوبودیەتی پێ رەوا هێنا، لە کۆیلەیەتی دەوروبەری رزگـار دەبـێ"[1]، ئەمـەش رێگەدانـە بـەوەی کـە ئـازادی لـە مـەقامی عوبودیـەت تـەواو مـەوجودبێ و کـە دیـارە بـۆ خـۆی هێڵێـك هەیـە، چونکە عوبودیەت بۆ حەقیقەتە، کەواتە نزیکبوونەوەیە کە ئازادی (حسـین بـن علـی منصـور) دەڵـێ: ئـەوەی ئـازادی دەوێ بابگاتـە عوبودیەت[2]، کەواتە پیاوانی تەصەووف دەیانەوێ چەمکی ئازادی لـە هـەموو رووەکانیـدا بخوێننـەوە و هێڵـەکانی دەستنیشـان بکـەن، چونکە دەمێکە رێبەر لەبەردەم ئەم ئەزموونە دایە و ناچێتە جیهانێك تیایدا ون بێت، لەم رووەوە (جنید) دەڵێ: ناگەی بە ئازادی باڵا، تاکو ئـەوەی لـە عوبودیـەت مـاوە بەدەسـت نـەهێنی[3]، لەمـەوە چـەمکی

---

١ – الرسالة القشيرية، ص١٧١.

٢ – هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣ – هەمان سەرچاوەی پێشوو .

ئازادی هاوشان لەگەڵ ئەم مەقامە گوزەر دەکات و گرفتی چەمکەکان دەستنیشان دەکات بۆیە (بشر الحافي) دەڵێت: ئەوەی دەیەوێ ئازادی بچێژێ و لە عبودیەتدا بحەسێتەوە با نێوان خۆی و خودا پەردە نەهێڵێ"[1]، لەبەر ئەوە پێویستە لایەنی ئیجابی و سەلبی چەمکەکان بناسین، کە رەنگە ئێستا لا لەم بابەتە بکرێتەوە، گەرمی دەبینین ئەگەر پیاوانی تەسەووف ناویان نەنابێ، بەڵام بە روونی لایەنی ئیجابی و سەلبی چەمکەکانیان باسکردووە، ئازادی بە هەموو ئەو هێڵانەی بەستراوەتەوە و پێکی دەهێنێ روونیان کردۆتەوە، ئازادی چەمکێکە بە رۆح و حەقیقەت بەستراوەتەوە، ئەمەش سێیەمنێکی پر مەغزایە، چونکە هاوکێشەیەك دروست دەکا کە بۆخۆیان لەدوا ئەنجامدا دەگەنە یەك وێستگە، کە هەموویان لەسەر زەمینەی خود دەست پێ دەکەن و بەیارمەتی (یەقین)ەوە گەشە کە دەست پێدەکەن بۆ خۆی رێ و رەسمی تایبەتی هەیە، بەڵام لە ئەنجامی مومارەسە و ئەزموون و چوونە دونیا پاکێتی و خاوەن بوونەوە، ئەوا پلەیان بۆ (یەقین) داناوە، ئازادیش لەو دیوەوە بوونی هەیە، تاکو ببێتە زامنکەری گەیشتن بە حەقیقەت، خودی مرۆڤ دەگەرێتەوە سەر بنەمای سەرەتاکەی، دەگەرێتەوە ئەو ئەسڵەی دروستی کردووە کە دوورە لە فەنا بوون و هەرگیز لەناو ناچێت، ئازادی بەم ریشاڵانەوە چەمك دەگرن، کە لە سەراپا جەستەی جیهانی تەسەووف بوونی هەیە، بۆ ئەوەی حەقیقەتی شتەکان دوور لە کاریگەریەکان بناسێ، وەکو خۆیان کە هەن، تاکو دەگات بە یەك حەقیقەت.

---

[1] – هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# شیـعر و تەسـەووف [١]

چۆن دەتوانین بیناییمان وەك دەروازەیـەك بە جیهانێك بسپێرین، تیایدا هەموو شتەكان بەپاكی و پاكیزەیی ببینین!!؟ لە شوێنێكدا ئەگـەر هـەموو دونیـا نغـرۆی چڵێسـی بـێ، كەچـی لـە جیهـانی ناوەوەماندا ئەو تروسكە رووناكییە بە سەراپا قەوارەمان دەكشێ و دەمانگەیەنێتە گەوهـەرێك لـە حەقیقەت دەكات، كەواتـە بەر لـە هـەر شـتێك ئـەو راسـتیە دەردەكـەوێ، كـە دوو جیهـان هـەن، یـەكێكیان لـەناوەوە دایـە، كـە سەرچـاوەی روانگـە و بینینـی ئێمـە دەنـوێنێ، دونیایەكـە هێنـدە قووڵـە لـەراز و نهێنـی و پێكهاتووەكـانی نـازانرێ، ئەوی دیكەشیان جیهانی دەرەوەیە، كە بۆخۆی جیهانێكی بابەتیە و بێ بوونی مرۆڤ مـەوداكانی زۆر ستەم دەكەونـەوە هـەموو ئەوانـەش ئـەو واقیعـەن لـەناو هەسـت و عـەقڵی مرۆڤـدا راڤـەكراون و لێیـان دەكۆڵرێتـەوە، كـە دیـارە ئـەو لێكۆڵینـەوەش بۆخـۆی ئاسـتێكی دیاریكراوی هەیە و ناتوانێ زیاتر لەوە بكشێ.

جیهـانی نـاوەوە زۆر حاڵـەت و بـوار هـەن بەیەكـەوەیان دەبەستێتەوە و بەرجەستەیان دەكا، هەرچۆنێك بێ شاعیر هێنـدە بـەوە خەریكـە هەسـت و سـۆز و ویـژدان و حاڵەتـە دەگمەنـەكانی بپارێزێ، هێندە ناچێتە دونیایـەكی ئـەزموون و وشك لەوێدا بوونی

---

[١] – ئەم بابەتە لە گۆڤاری (كاروان) لە ژمارە (١٣٦)ی ساڵی (١٩٩٩) زایینـی لاپەڕە (٢٣ و ٢٤) دا بلاوكراوەتەوە.

خۆی تێکەڵ بە ئەوانی دی بکا، بۆخۆشی ئەمەی قبووڵ نیە، بۆیە بەردەوام دەخوازێ جیهانێك بنیاد بنێ لەواقیعە وشکەکە خاوەن خەسڵەتی زیاتر بێ، جیهانێك لە گومڕایی دووری بخاتەوە، جیهانێك دەروونی پاك بکاتەوە، چونکە ئەو هەموو گومڕایی و نیگەرانیەی تەنیویەتی دەروونی هیلاك دەکەن و سەراپا قەوارەی دەخەنە مەترسی، چونکە ناتوانێ لەو پێودانگانە دەرچێ کە بنەمایان لەسەر حاڵەت و هەست و سۆزو بڕێك لە عەقڵ دامەزراوە.

کەچی جیهانی تەسەووفیش هەم لە ڕووی بیرو بۆچوون و هەم لە ڕووی مێژوو، هەروەها مومارەسە کردنیەوە، جێگەی هەڵوەستەیەکی گەلێ زۆرە و بۆ نێو بابەتی فراوانمان دەبا، چونکە تەنیا پێناسینی چەندان بەرگ و کتێب لەخۆ دەگرێ و تا کرۆکی بابەتەکانیش دەکشێ، مەبەستیش لەوە ئەوەیە بۆ خۆی لە جیهانی ناوەوە شتەکان بنیاد دەنێ و لەوێوە سنووری دەکشێ و ئەو هەستانە لە جیهانی رەق و تەق وەردەگرێتەوە و لەسەر رەوشی بنیاتی جوان و بێگەرد دروست دەبێ، چونکە پێناسەکانی لە ڕادەبەدەرن و سۆفی هەوڵ دەدا بۆ ئەوەی ژیان زیاتر کامڵ ببینێ وەك قۆناغی یەکەم، ئینجا لە وێوە پێ هەڵدەگرێ بۆ ئەوەی لە پێناو کەموکوڕییەکانی هەوڵ بدا پڕیان بکاتەوە، بەو پێیە شاعیریش هەوڵ دەدات ئەو چڵێسیەی لە ژیاندا هەیە، بەلاوە بنێ، کە ئەوەش خۆی لە خۆیدا بە لاوەنانی لە دوا وێسگەدا دەبێت ئەلتەرناتیڤێك هەبێ، گومان لەوە نیە جیهانی شیعر هێندە قووڵ و تامەزرۆیانە لەگەڵ ناوەوەی مرۆڤ مامەڵەی کردووە، خاوەن مێژوویەکی سەرسامکەرە لەوەوەش پەیوەندی

تەسەووف و شیعر بەدەر دەکەوێ، چونکە هەردووکیان دەیانەوێ جیهانێك بنیاد بنێن لەواقیع چڕ و پڕتر و کاملتر بێ، گیانی ناڕەزایی هەردووکیان یەك سەرچاوە پێکدێنێ، تەسەووف بە هیچ کلۆجێ قبوولی نیە دەوروبەر یا شتەکان هەرچەند گەورە و قورسیش بن لێلی بکەن، لەوەوە کارای تەسەووف بەسەر واقیعدا دەردەکەوێ، بۆیەکە لەواقیع رازی نیە، تەنیا گیانی ناڕەزایی دەر ناخا، بەڵکو لە جیهانێکدا نەشونما دەکا بۆخۆی تەواوی پێگەکانی دامەزراندووە و شیعریش بەرامبەر جیهانی دەرەوە هەمان هەڵوێست دەنوێنێ، بۆیە هەوڵدان لە پێناو گۆڕانکاری کارێکی حەتمییە و لەو دەروازە بەدەر هیچ جیهانێکی دیکە رێك ناکەوێ.

تەسەووف کردوویەتیە ئەرکی سەرشانی لە هەموو بووندا بچێتەدەر، ئەوەش هەنگاوێکە بۆ ئەوەی لە بینایێکەوە تەماشای بوون بکا لەخۆی بەدەربێ "کە مەبەستمان بوونە" بەهەر جۆرێك بێ کە شاعیر هەست و هەرچی لە قەوارەیدا هەیە بۆ ئەزموون بیکاتە دەروازەیەك جودا لەواقیع تەسەووفیش دەیەوێ لەگەڵ ئەوەی ئەو جیهانە لێلی نەکات، کە دیارە لە یەکەم هەنگاویدا ئەوەی کردۆتە سەرچاوە، ئەو دونیایە لەچی پێکهاتووە و چۆن گیانە بەدو چلێسەکان بەڕێوەی دەبەن!! ئەوا هەموو لێلییێك بەو روون دەبێتەوە، خودی ئەو توانایەش کارێکە مرۆڤی سادە پەی پێ نابات، چونکە زەمینەیەك دەخولقێنێ جگە لە پاکێتی هیچی دیکەی لێ ناڕوێ و تەنیا لەگەڵ خودای گەورە و بێ پێویستی و هیچی دی.

شیعریش دەیەوێ (من) بەرەو رامان بەرێ، کە تەسەووف هەموو هەست و ئەوەی لە قەوارەیدا بە ئامارژەی نوێ بەکاردێنێ، چونکە ئامارژە بۆ کراوەکان سێبەری بوونیان بەسەرەوەیە و دەرچوونیان لەو سێبەرە چەمکی راستەقینەی خۆیان دەدۆزنەوە، چونکە واقیع لە زۆر کۆتوبەند رزگار دەکەن، شیعریش هەرچی لەو حاڵەتەدا بەزەین تێ دەپەڕێ بۆ رامان ئامارژەی دیکە و چەمکی دیکەی دەداتێ، کەرامان کاریگەری قووڵی بەسەرەوە هەیە، بۆیە شیعر و تەسەووف لەیەك ناوەنددا لەگەڵ حەقیقەت پەیوەست دەبن بۆ ئەوەی گیانەکان لە بەد و چڵێسی بپارێزن و ئینجا لە واقیع بەدەری بنێن، چونکە بە پلەی یەك ئەوەی قەوارەمان ئازار و ئەشکەنجە دەدا، دەیەوێ لێڵی قەوارەمان خەستتر بکات و روونیەکان ئەو روونیانەی پێناسە کردنیان ستەمە و تەنیا لە جیهانی ناوەوە چەمك دەگرن- لە وێدا لە ئازار و ئەشکەنجە دوورمان دەخەنەوە، بۆیە وێنەی شتەکان بەوپەڕی سەربەستییەوە لە شیعرو تەسەووفدا دەبینرێن، وەك ئەوەی کەسانی دی سەیریان دەکەن نابێت، چونکە ئەوان لەگەڵ ئاکارە سادەکانی رۆژانە و کۆمەڵ بە قووڵی تێکەڵ دەبێت و هەوڵ دانیان بۆ دۆزینەوەی ئەم پانتاییە سست و لاواز دەبێت بۆیە چەمك و مەغزای ئامارژەکان لەوێوە لە دەرەوەی خۆیان بۆیان پێناسە دەکرێ، ناتوانن روانگەیان لەوە چڕ بکەنەوە تاکو ناکۆکی شتەکان ببینن.

تەسەووف لە دونیادا بە تەواوی (فەنا) دەبیّ، بۆ ئەوەی لە جیهانی حەقیقەتدا (بەقا)بیّ، ئەوەش چەند (مەقام) و (حالّ)ی تایبەتی بەخۆیەوە گرتووە، بەلاّم وەك دیارە شیعریش لەو پانتاییە ریّچکە دەگریّ، چونکە ئەو (پاکژ کردنە) بۆ ئاستیّکە یەکسەر سەراپا گیان بگریّتەوە و قەوارەی مرۆڤ پاك بکاتەوە تەسەووف دەیەویّ دەروون لەو تاریکیانە هەلّمالیّ کە دەوری حەقیقەتیان تەنیوە و دەبیّ سەرەتا بەهۆی ئیرادەوە یەکەم هەنگاوی بنیّ، ئەوەش کە دەلّیّ لەخۆیەوە دەست پیّ دەکا، بەو پیّیە دەیەویّ بچیّتە جیهانیّك لە کۆتوبەندی جەستە رزگاربیّ، کە ئەوانی دی پیّیەوە دەتلیّنەوە و روانگەیان تەسك بین دەبیّ، چونکە ژیانی ئەو گۆی زەمینە بۆخۆی گەلیّ کەموکوڕی تیّدایە، بۆیە ئەو دەروونەی ئینتیمای ئەو دونیایە دەکات دەبیّ بکوژریّ و هەستەکانیش سڕ کریّن کە بۆ ئەو دەروونە کار دەکەن، شیعریش جیهانیّکە لە دەرەوەی پیّناسین، هیّندە لە شتەکان دوور دەکەویّتەوە بۆ ئەوەی زیاتر بیانناسیّ و بتوانیّ لە حالّەتی رامان ئەو سەکۆیە بخولقیّنیّ بۆ ئەوەی هەستەکان فریو نەخۆن، بتوانن حەقیقەتی قەوارەی مرۆڤ بناسن، بۆیە لەگەلّ تەسەووف خۆیان سازدەکەن بۆ ئەوەی لە ساتە وەختەکاندا دەروون لە گیانی پاك و بیّگەرد پڕ بکریّ و لە چەواشەیی هەستەکان ڕزگاربن، چونکە تەسەووف و شیعر هیّندە بە ئاکارە کۆمەلاّیەتیە وشکەکان کاریگەرنین و دیاریشە هەردووکیان ئینتیمای حالّەت دەکەن و بۆخۆیان بەگویّرەی مومارەسە کار دەکەن، بەلاّم ئەوانە ناتوانریّ هەردووکیان بکاتە یەك جەستە، بەقەد ئەوەی هەردووکیان

دەیانەوێ جیهان لە کەموو کوڕی رزگار بکەن، بەتایبەتی ئەوانەی بوونەتە بارێکی گران بەسەر قەوارەی مرۆڤدا، بۆیە (من) لەلای هەردووکیاندا هێندە پابەند نابێت، هەریەکەیان بەگوێرەی حاڵەت و زاراوەی خۆیان یا بەپێی بەرنامە یا نیمچە بەرنامە بەرەو ناوەوەی خۆیان هەنگاو دەنێن.

شیعر و تەسەووف پرۆژەیەکی فراوانە و ئەگەر بە قووڵی لێی بکۆڵرێتەوە، زۆر هەڵدەگرێ، بەڵام ئەوەی جەختی لەسەر دەکرێتەوە، هەردووکیان لە جیهانی ناوەوە لەنێو پانتایی ئەو دیو هەست بەوپەڕی ئازادی بە بەرنامەوە پرۆژە بۆ دروست کردنەوەی جیهان دێننەوە، بە ئەلتەرناتیڤێك تاکو دیسان دوور لە کەموکوڕی، دونیا بینا بکەنەوە.

# تـەريـقـەت و شـەريـعـەت

شەريعەت روونكردنەوە و باسكردنی ڕێگای خودايە بۆ خەڵكی بـەهۆی ئايينـەوە، واتاكـەی روونيشـە چـونكە ئـەو ڕێگايـە شـيكراوەتەوە بەكۆمـەڵێ فەرمانـەوە، مەبەسـتمان لـە فـەرمانی ئيلاهی يە، لەبەر ئەوە ئەم فەرمانانە بۆ خۆيان بريتين لە كۆمەڵێ ئەرك بۆ خەڵك، كەواتە خەڵك لێرەدا لە بەرامبەر ئەركدا بەر پرسيار دەبنـەوە، ئـەم بەرپرسـياريەتەش بـۆ ئەوەيـە لـە بەرامبـەر خـودادا (عبوديـەت)ی خۆيـان بسـەلمێنن، سـەلماندنی ئـەم پايەيـەش بـەديتنی -حەقيقـەت- دەبـێ، كەواتـە هـەر ڕێگايـەك دووربـێ لـە حەقيقەت، بەهـەمان شێوە شـەريعەتيش نييـە، چونكە وێنـاكردنی حەقيقەت بەندە بە بنچينەی شـەريعەتەوە، كە لـە خواوە ڕێچكەی گرتووە، وێناكردنی حەقيقەتيش لەسـەر پايـە و دامـەزراوەی دڵ و فكـر و ديتنـەوە دێتـە دی، شـەريعەت ئـەو شـێواز و ڕەفتارەيـە بەهۆيەوە دەگەين بە خودا، خودا حەقيقەتە.

تەريقـەتيش لـە سوننەتی پـيرۆزەوە هـاتووە، كەواتـە ڕووكردنـە قەناعەت بە تەنها بە خودا و پشت كردنە دونيا يا كەمكردنـەوە لـە دونيـا نـاوەڕۆكی تەريقەتـە، تەريقـەت بـە تەوازووحـەوە -خـاكی- بەستراوەتەوە، ڕێبـازی سـۆفيگەری بنـەمای تـەريقـەت يـا سـوننەتی بـەو هـەنگاوە بەسـتۆتەوە، كـە دەبێـت بـە تەوازووحـەوە پشـت لـە دونيا بكا، لێرەوە پشـت لـە دونيـا كـردن چيـە؟! ئـەم ڕەهەنـدە هـەم

باری مەعنەوی و هەم باری مادی هەیە، هەر دوو باریش پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە، چ پشت کردن لەو بارانە کە پەیوەندن بە باری مەعنەوی وەکو چێژ و هتد، پشت کردنە دونیای باری مادییات وەکو سامانی دونیا.

شەریعەت مەعریفەی ئەو شێوازەیە بۆ گەیشتن بە خودا و حەقیقەت بینینی بەردەوامیەتی و تەریقەت شێوازی ڕێگای شەریعەتە، بەواتا کارکردن بۆی، بەو پێیەی شەریعەت و حەقیقەت لە یەك ناکرێنەوە، شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی هەر یەکێکیان پەیوەندی بە ئەوی دیکەیانەوە هەیە و بەشێکی ئەویان پێکدێنیٚ، حەقیقەت پێچەوانەی ناراستی یە، لەبەر ئەوە ئەگەر ناراستی بریتی بێت لە چەندین پارچە و بەش، ئەوا حەقیقەت و حەق یەك پارچەن و بەش بەش ناکرێن.

ڕێبازی سۆفیگەری پێی وایە هیچ حەقیقەتێك بەبیٚ شەریعەت لە ئارادانیە بەهەمان شێوەیەش هیچ شەریعەتێك بەبیٚ حەقیقەت لە ئارادا نیە (شێخ محی الدین ی عەرەبی)(قدس الله روحە) پێی وایە: (هەر زانستێك لە ڕێگەی کەشف و ئیلقاوە حەقیقەتێکی پێچەوانەی شەریعەتی باو لەگەڵ خۆی بێنیٚ، پێی وەرناگیردریٚ، ئەو زانست و کەشفە جێگەی متمانەنین، بەڵام ئەگەر زانستی حەقیقەت پێچەوانەی شەریعەت نەبێت، ئەوا ڕێگای ڕاستە، بەڵام ئەگەر شەریعەت بەرپەرچی دایەوە، متمانەی پیٚ ناکریٚ و پێی وەرناگیردریٚ).

کەواتە: لێرەوە بەو پێناساندنە دەردەکەویٚ کە چەمکی تەریقەتیش ناگریٚ لە دەرەوەی شەریعەت و حەقیقەت بوونی هەبێت، چونکە تەریقەت کار و کردەوە و دەوروبەر و جلوبەرگ و هەرچی

هەیە لە پێناو یەك ڕێگەدایە و ئەو ڕێگایەش نابێتە دوو ڕێگا، چونکە ئـەوەی لـەبارەی خـواوەوە راسـتە، هـەمان خـودی حەقیقەتـە، شەریعەتیش یەك زانستە کارەکانی بریتین لە کاری دەرەوە (الظاهر) و کـاری نـاوەوە (البـاطن)، نابێـت ئـەم زانسـتەش لەیـەك جـودا بکرێتـەوە، کـاری دەرەوە سـەربەخۆ بێـت و کـاری نـاوەوەش سەربەخۆبێت، لەراستیدا هەردووکیان ناوەرۆکی یەك زانستن.

هەرکاتێ ئەو زانستە لە دڵەوە لە ناوەوەی مرۆڤە سەرچاوەی گرت ئەو کاری ناوەوەیە (باطن)ە، لەوێوە دەروا تاکو بەدەرکەوێ بێتە ئاستی دەرەوە (الظاهر)، بۆیە لەسەر زمان خۆی بە دەردەخا، ئەگەر کارەکە هەر تەنها زمان بێت زۆر مایە پووچ دەردەچێ، لەبەر ئـەوە (ظـاهر و البـاطن) بەشـێکن لـە جەسـتەیەکی یـەکگرتووی سۆفییەت، کە ئەویش بەهۆی تەریقەتەوە کار دەکا.

زانستی شـەریعەت کار دەرەکییـەکان (الظاهر) بـریتین لـە زەکات و نوێژ و حەج و جیهاد، کە ئەمانە پێیان دەگوترێت (عیبادات)، هەروەها کاری دیکەش هەن وەکو حدود و تـەلاق و فرۆشتن و قەساس و هتد، ئەمانەش بریتین لە (ئەحکام)، هەرچی کارە ناوەکییەکانن بـریتین لـە کـاری دڵـەکان کـە ئەمـەش بریتیـە لـە (مـەقام) و (حـاڵ) کـە تیایـدا پەیرەوانی ڕێگای تەریقەت وەکو پایەکان بریتین لە بەشی (گـۆڕاو) و (نـەگۆڕ) تیایـدا بـە راسـتی و حەقیقـەتی یـەکتا دەگـەن، (مـەقام و حاڵـەکان) بـریتین لـە (ئیمـان – بـاوەڕ) یـەقین، راسـتگۆیی، راستکردن، پەسەندکردن، ئیخلاص، تۆبە، مەعریفە، تاعەت، تـەوەکول، مەحەبـەت، رەزا (رضـا)، زیکـر، شـوکور، ئینابـە، خەشـیەت، تـەقوا، موراقەبـە، ئیعتیبـار، فکـرە، خـەوف، رەجـا، سـەبر، قەناعـەت، تەسـلیم، حـوزن، نەدەم، خەجەل، شەوق، وەجد، تەعزیم، ئیجلال، هیبە.

لەبەر ئەوە (ظاهر و باطن) یەك پارچەن، وەك چۆن ناتوانریٚ شەریعەت و حەقیقەت لیٚك جودا بکریٚتەوە، ئەو پەیوەندییەش بەهەمان شیٚوەیە لەگەلٚ تەریقەتدا، چونکە بروا بوون بە حەقیقەت و شەریعەت، بروا بوونە بە تەریقەت، هیچ تەریقەتیٚك لە دەرەوەی شەریعەت و حەقیقەت وجودی نییە.

تەریقەت دوور کەوتنەوەیە لە ئارەزوو و خورخدە، چونکە بنچینەی ئەخلاقی لەسەر گەڕان بە دوای حەقیقەتە، ناکریٚ روو لە ئارەزووەکان بکەی و لەسەر ریٚگای حەقیقەت بیٚت، (ئەبو تالیبی مەککی)(قدس الله روحه) لە چیرۆکی (ئیسرائیلیات) {باس لە پیاویٚك دەکات کە ژنیٚکی خواستبوو، ژنەکە مالٚی لەگەلٚ خزمانی نزیکەی مانگیٚك ریٚ دوور بوو، نۆکەریٚکی ناردە مالٚی خزمانی ژنە، تا ژنەکەی بۆ بیٚنیٚ، نۆکەر رۆژیٚك لەگەلٚ ژنە رۆیشت شەیتان هاتە لای و پیٚی گوت نیٚوان ژنە و تۆ مانگیٚك ریٚ هەیە، بۆ چیٚژ لە ژنە وەرناگری تا دەیبەیەوە لای میٚردەکەی، ئەویش ریٚگەت لیٚ ناگریٚ، بەلٚکو لەلای پیاوەکەی هەوحیشت دەکا، نۆکەریش هەلٚسا و دەستی بە نویٚژ کرد، گوتی: خودایە! دوژمنت هاتەلام، دەیەویٚ هەرچی خراپەی دەروونم هەیە بیپرژیٚنیٚ، منیش یەك مانگی تەواو بیٚ تاقەتم" هەموو شەویٚ دژی ئەو شەیتانە دەجەنگا، تا دوا شەو هات، لەو مەینەتیە رزگاری بوو، کە رۆژ هەلاٚت ژنەی داوە دەست پیاوەکەی، سوپاسی خوای کرد کە لەو خراپەکاریە دوور کەوتەوە، دواتر خودا نیعمەتی خۆی بەسەردا باراند، تاکو (بووە) پیٚغەمبەریٚك لە پیٚغەمبەرانی (بەنی) ئیسرائیل }.

رێگا و تەریقەت ئەمەیە، دوور کەوتنەوە لە ئارەزوو دەروونی خراپەکاری و رووکردنە خودای گەورە چ لە باتین یاخود لە زاهیر، تاکو دەگەی بە نیعمەتی گەورەی خودا.

تەریقەت بە عەقیدە گرێ دراوە، لە پێناو گەیشتن بە خودا، ئەو رێگایە، هەر تەنها یەك رێگایە، لەبەر ئەوە شەریعەتیش هەر تەنها یەك شەریعەتە و حەقیقەتیش هەر تەنها یەك حەقیقەتە، گەیشتن بە خودا رێگایەکی تاقانە، هەر کەسێ ئەو رێگایە ببڕێ دەبێتە هاوڕێی راستگۆیی بەردەوام، کە ئەو هاوڕێیەتیەش لەلای ئیمامی (غەزالی) (قدس الله روحه) پایەی چوارەمە و ناوی ناوە ئەولیای تەواو.

کەواتە رۆیشتن لە تەریقەتدا بریتیە لە بەردەوامی و دواتر هەناسەیەك بۆ ئەوەی بە گوڕو تینێکی دیکە بەردەوامی و درێژە بە رێگەکە بدەین، لە راستیدا بینای تەریقەتیش لەگەڵ ئەوەی پایە و مەقامەکانی جودان، بەڵام ئامانج و مەبەستی سەرەکییان یەك شتە و لە پێناویەك شتە مورید کە رێگای بەرەو خودا دەبڕێ لە پێناو بەدەستهێنانی ئیرادەیە، لە پێناو بەدەستهێنانی مەعریفە و مەبەست و حاڵە، ئەو بە هەموو هەستەوەر و ناهەستە دەرەکانی بەشداری دەکا و لە حەز و ئارەزوو دوور دەکەوێتەوە کەواتە ئەو کاتەی حەقیقەت بەدەر دەکەوێ لە تەریقەت دا حەز و بەخت و ئارەزوو روو لە لێژی دەکەن، لەبەر ئەوە شەریعەت ئەوەیە بیپەرستی و حەقیقەت ئەوەیە بیزانی و تەریقەت لێی لانەدەی.

پەرستن و زانین و رێگاش سێینەیەکی گەورەن لە پێناو خودای تاقانەدا، چونکە لەو جیهانەدا بەهیچ جۆرێ رووکرانە حەز و

ئارەزووەکان بوونیان نییە، ئەمانەش بۆخۆیان چەکێکی گرنگن لە پێناو ئەوەی تاك بەرەو جیهانێکی کامڵ بوون بچێ و دواجار بەدەستی بهێنێ لە راستیدا پایەکانی تەریقەت پابەندە بە بەدەستهێنانی هەر مەنزڵێك کە ئەو مەنزڵە تیایدا ئەولیا لە خۆی دەگرێ، ئەولیای کامڵ دوا قۆناغە بەهۆیەوە دەبێتە هاورێی حەقیقەت، هەرچی سێ مەنزڵەکەی دیکەیە بەر لەو مەنزڵە دەبێ بەدەست بێ کە ئەوانیش ئەولیای نزیکن، ئەگەر دوو پلە لە ئەولیا بەدەست بێ ئەوانیش ئەولیای نزیکن، ئەگەر دوو پلە لە ئەولیا بەدەست بێ ئەوا لە پلەی شەهید نزیك دەبێتەوەو یەك پلەش بەدەست بێ ئەوا لە پیاوی ساڵح نزیك دەبێتەوە.

رێگای خودا سەرەتا بە زیکر کردن دەست پێ دەکا کە خۆی بریتیە لەکاری چاکە و نەهی لە خراپە، ئەمەش کرۆکی شەریعەت پێکدێنێ، کە سەرچاوەکەی لە نوور و بەخششەوە هاتووە، دواتر بیرکردنەوە ئارامی خاڵێکی دیکەی تەریقەتە کە ئەویش سەرچاوەکانی لە شەریعەتە هاتۆتە ئاراوە، لەبەر ئەوە هەر هەنگاوێکی تەریقەت بەبێ شەریعەت بەرێوەناچێ، لە قۆناغی سێیەمدا هەژاری بۆ خودا لە بەرهەمەکەی بە شوکورە دێتە دی، ئینجا زۆربەی زۆری قۆناغەکانی تەریقەت بەهۆی شەریعەتەوە پێ دەگرێ، چونکە هەر هەموویان لە رێچکەی خوداوە سەرچاوەی گرتووە، ئەم رێچکەیەش بە تەواوی جەستە و روحەوە دارێژراوە و ناکرێ هەر تەنها روح پێش بخرێ و پشت لە جەستە بکرێ، ئەم هاوکێشەیەش پێیەوە پابەندە و لە پێناو گەیشتن بەخودا ناکرێ

به یەکیان بەرەو تەریقەت بچین، بەر لە هەر شتێك ئامادەکردنی دەروون پابەندە بە خودی جەستە و روح.

لە راستیدا چەند بەرەو تەریقەت بڕۆین، دەبێ چەکی شەریعەت و حەقیقەت لە خۆمان تەیار بکەین، لەبەر ئەوە تەریقەت لەسەر چەند بنەمایەك وەستاوە، کە بەشێوەیەکی سەرەکی پابەندە بەخودای گەورە، لەبەر ئەوە دەتوانین رووکار و مەغزای بەم جۆرە بناسێنین!.

١) خووگرتن بەداب و ئەخلاقی خودای گەورە.

٢) نزیکی لە فەرمانەکانی خودا و ملکەچی بۆی.

٣) پشتگوێ خستنی سەرکەوتنی دەروون، لە پێناو سەرکەوتنی ئەرك و فەرمانەکانی خودای گەورە.

٤) هاوڕێیەتی راستگۆیی و مانەوە لەگەڵ خودای گەورە.

## تــەســەووف بـــۆ؟!

ئەگــەر بگەڕێینــەوە بــە رابــردوودا دەبیــنین لــە هەنــدێ قۆناغــدا سۆفیگەری کاردانەوەیەك بووە بۆ چاکسازی و بەها مرۆڤایەتیەکان و چاکسـازیش دەبـێ سـەرەتا لـە خـودی مرۆڤـەوە، مـرۆڤ لەخۆیـەوە دەست پێ بکات و رەنگدانەوەی هەبێت لەسەر دەوروبەر تا تیشکی ئەم روناکیە بگاتە تەواوی کۆمەڵگا بۆ بەدەست هێنانی راستیەکانی ئیمـان و گەیشـتن بەچـێژی نـەبڕاوەی کانیـاوی روونـی حەقیقـەت، هەرکاتێ مرۆڤ لە زەت و تامی ئیمانی چێشت ئەوە بە دڵنیاییەوە، هەست بەبوونی بەختەوەرییەکی کراوەدا دەکا.

ئـــەو بەختەوەرییـــەش دەبێتـــە هۆکـــاری بونیادنـــانی شارستانیەتێکی ئارام و مرۆڤ دۆست و سەقامگیر.

ئـەم دەسـتە بـڕێرە خۆنەویسـتی و دونیـا نەویسـتی هەڵدەبـڕێرن، بەرەو پتەوکردنی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودا، واتە بەندە و خودا.

کەواتە رزگار بوون لە (من)ی سۆفیەکان و گەیشتن بە (نـەمان – فناء) و یەکبوون لەگەڵ بووندا بە کۆشش و هەستکوژی.

وشـەی رێبـاز (تەریقـەت)، ئـەو رێگایەیـە سـۆفی دەیگرێتـە بـەر بەرەو خودا، ئەم رێگایـە (پایـە) و (وێسـتگە)ی هەیـە بـە (نشـینگە) ناسراوە یان (پێگە) تیایدا، رێوان (حاڵەتـەکان)ی گیانی دەزانێت لەهەر پلەیەکدا، لەم رەوتەدا بەرز دەبێتـەوە تـا پلـەی (بینـەوەری – شهود) و (دۆزینەوە – کەشف) و ئاشکرا بوونی پـەردەی هەسـت،

له ڕێگای ئەم بینەوەرییەدا (هەندێ ڕاستی بوون دەزانن، کەسانی دیکەی پێنازانن، زۆر ڕووداو دەزانن پێش ڕوودانی، بەتوانا و لێهاتوویی دەرونیان کار له بوونەوەرانی خوا ڕوو دەکەن و دەبنە ملکەچی ئەوان)[1]، دەزانن له سۆفیگەری ئیسلامدا بالآچوون (العروج) بۆ ئاسمان له ئاراداییە وەك (میعراج)ەکەی پێغەمبەر(ﷺ)، بەرەو کانگای زانین، هەندێکیان له زێدە ڕۆیدا دەڵێن: وەك پێغەمبەر(ﷺ) (عروجمان) کردووە، وەك (ئەبو یەزیدی بەستامی) له کتێبی(اللُمَع، ص ٤٦٤)دا هاتووە دەڵێت: (أول ماصرت إلى وحدانية، فصرت طيرا جسمه من الأحدية، وجناحا من الديمومية، فلم ازل اطير في الهواء الكيفية عشر سنين، حتى صرت إلى هواء مثل ذلك مائة الف مرة، فلم ازل اطير إلى ان صرت في ميدان الأزلية، فرايت فيها شجرة الأحدية..) سەرەتای ڕۆیینم بەرەو یەکتاپەرستی، بووم بە باڵندەیەك جەستەی له یەکتایەتیە، دوو باڵەکانی له بەردەوامییەتە (مانەوەیە)، بەردەوام له هەوای چۆنیەتیدا بیست ساڵ فڕیم، تا گەیشتمە هەوایەکی وەك ئەو سەد هەزار جار هەر دەفڕیم تا گەیشتمە مەیدانی تا هەتایە، تیایدا داری یەکتاپەرستیم بینی.

---

١ – المقدمة، ط١ دار الكتاب اللبناني، ص٤٨٦.

ئەوەتا پێشەوا قوشەیری لەم بەیتەدا دەڵێت:

وجـودي أن أغيـب عن الـوجـود

بـمـا يـبـدو علـى مـن الـشـهـود

بەکوردی:

بوونم لە ونبووندایە لە بوون

بەو بینینەی لەمنەوە دەردەکەوێت

سۆفیگەری لە جیهان نەویستی و خۆنەویستی و ترسی خودا لـە نێـو موسـڵمانانـدا سـەری هەڵـداوە.. بەگشـتی کۆمەڵـە رێگـا و وێـردێکن لـەکاتی جیـا جیـا دەیانڵێتـەوە، بـەپێی رێنـوێنی پـیری رێبازەکە بە ئامانجی پاك کردنـەوەی دەروون و باڵاچوون لـە پلـە و پێگە گیانییەکان تا پلەی پێشکاری (الولاية).

بزووتنـەوەی سۆفیگەری لە جیهانی ئیسلامیدا لە سەدەی سێی کۆچـی گەشـەی سـەند چ وەك رێچـکەی تاکـە کـەس وەك رێبـازی بـەناوبانگ، ئامانجیـان پـەروەردەکردنی دەروونـە و باڵاچـوونە بـۆ گەیشتن بە خودا ناسی بە دۆزینەوە و بینین.

پێکهاتــە: سەرچــاوە و پێکهاتــەی ســۆفیگەری ئیســلامی سەرەڕای توخمە سەرەکییەکانی ئیسلام دەقە شـەرعییەکان و داب و نەریتی ئیسلامی.

ڕۆشنکاریش ئەمانە دەگرێتەوە:

١) سروش (ئیلهام) دەشێ لە خوداوە و ڕاستەوخۆ.
٢) ڕاستەوخۆ لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) شتیان پێدەگات، چ بە ئاگاییەوە (یقضة) یان لە خەودا.
٣) عەزرەتی خزر و ڕێنمایی لێ وەرگرتن.
٤) ڕوو بژێری (الفراسة)، زانینی ختوکەی دڵ و خواستەکان.
٥) گاس، گوێ بوون لە دەنگی ونداریی.
٦) شەوڕۆیی و باڵاچوون بە ئاسماندا.
٧) ڕۆشنکاریی هەستی، ئەو دیو بەرهەست بینین.
٨) خەون و دیدگا.
٩) تێفکرین لە ڕێنمایی پێغەمبەرانی دیکە(علیهم الصلاة والسلام) و پیرو پیاوچاکان.

## پێشەوا بەناوبانگەکانی تەسەووف:

- پێشەوای گەورە (جعفر الصادق) (م ١٤٨ ك).
- شێخ (حسن البصري) (م ١١٠ ك)[١].
- پێشەوا (ابو حنيفة نعمان بن ثابت) (م ١٥٠ ك).
- پێشەوا (مالك بن أنس) (م ١٧٩ ك).
- پێشەوا (محمد بن إدريس الشافعي) (م ٢٠٤ ك).
- پێشەوا (احمد بن محمد بن حنبل) (م ٢٦٤ ك).
- خواناسی گەورە (رابيعة العدوية) (م ك).
- شێخ (حبيب العجمي) (م ك).
- شێخ (داود الطائي) (م ك).
- پێشەوا (ابو حمزة البغدادي) (م ك).
- پێشەوا (شيبان الراعي) (م ك).
- شێخ (معروف الكرخي) (م ٢٠٠ ك).
- شێخ (سري السقطي) (م ٢٥١ ك).
- شێخ (جنيد البغدادي) (م ٢٩٧ ك).
- پێشەوا (مالك بن دينار) (م ك).
- پێشەوا (إبراهيم بن أدهم) (م ك).
- شێخ (عبدالقادر الكيلاني) (م ٥٦١ ك).
- پێشەوا (ابوحامد الغزالي) (م ٥٠٥ ك).
- پێشەوا (السيد أحمد الرفاعي) (م ٥٧٨ ك).
- پێشەوا (ابو إسحاق إبراهيم الهروي) (م ك).

---

١ – م: واتە مەرگ . ك: واتە كۆچی .

- پێشەوا (ابو قاسم عبدالكريم بن هوزان القشيري) (م ك).
- پێشەوا (ابو نعيم الأصفهاني) (م ٤٣٠ ك).
- پێشەوا (ابو قاسم نصرآبادي) (م ك).
- شێخ (علي رُذباري) (م ك).
- پێشەوا (ابو عباس الدينوري) (م ك).
- پێشەوا (بكار بن قُتبة) (م ك).
- شێخی گەورە (محيي الدين بن عربي) (م ٦٣٨ ك).
- پێشەوا (حسين منصور الحلاج) (م ك).
- شێخ (بايزيد البسطامي) (م ٢٦١ ك).
- پێشەوا (مسند معمر جمال الدين ابي محاسن يوسف الحنبلي) (م ك).
- پێشەوا (شمس الدين ابي عبدالله محمد مقدسي) (م ك).
- پێشەوا (شرف الدين ابي البركات محمد جزامي المالكي) (م ك).
- پێشەوا (بهاء الدين أبي حسن علي بن ابي قاسم سليمان الطبراني) (م ك).
- پێشەوا (رُوَيم بن أحمد البغدادي) (م ك).
- پێشەوا (ابو تراب النخشبي) (م ٢٤٥ ك).
- پێشەوا (ابو سليمان الداراني) (م ٢١٥ ك).
- پێشەوا (احمد بن ابي الحواري) (م ك).
- شێخ (محمد بن خفيف الشيرازي الشافعي) (م ك).
- پێشەوا (ابي فضل محمد مقدسي) (م ك).
- پێشەوا (سلطان العلماء عز الدين بن عبدالسلام) (م ك).
- پێشەوا (إبن صلاح الشهرزوري) (م ك).

- پێشەوا (محيي الدين ابو زكريا النووي) (م ٦٧٦ ك).
- پێشەوا (تقي الدين السبكي الشافعي) (م ك).
- پێشەوا (تاج الدين السبكي الشافعي) (م ك).
- پێشەوا (إبن حجر العسقلاني) (م ك).
- پێشەوا (أبي حسن الهكاري) (م ك).
- پێشەوا (سراج الدين ابي حفص عمر إبن الملقن الشافعي) (م ك).
- پێشەوا (جلال الدين السيوطي الشافعي) (م ك).
- پێشەوا (جمال الدين محمد بن علي الصابوني) (م ك).
- پێشەوا (أبي طاهر السلفي) (م ك).
- پێشەوا (إبن حجر الهيتمي) (م ك).
- پێشەوا (ابو سهل التستري) (م ٢٨٣ ك).
- پێشەوا (عبدالله بن المبارك) (م ك).
- شێخ (علي الخواص) (م ك).
- پێشەوا (صلاح الدين الأيوبي) (م ك).
- پێشەوا (عبدالوهاب الشعراني) (م ك).
- پێشەوا (شمس الدين الرملي الشافعي) (م ك).
- پێشەوا (شهاب الدين الرملي الشافعي) (م ك).
- پێشەوا (جلال الدين المحلي الشافعي) (م ك).
- پێشەوا (شهاب الدين القسطلاني) (م ك).
- پێشەوا (محمد الفاتح) (م ك).
- شێخ (إسماعيل وليانى) (م ك).
- شێخ (معروف النودهي) (م ك).
- حەزرەتی (كاك احمدی شێخ) (م ك).

- شێخ (نور الدين البرفكاني) (م ١٨٥١ ز).
- شێخ (مولانا خالد النقشبدني) (م ك).
- شێخ (حسن القرجيواري) (م ك).
- پێشەوا (الباجوري) (م ك).
- پێشەوا (إبن عجيبة) (م ك).
- پێشەوا (يوسف بن إسماعيل النبهاني)(م ك).
- شێخ (كمال الدين مصطفى هوليري)(م ١٩٨٦ ز).
- شێخ (عثمان سراج الدين القادري النقشبندي) (م ١٩٩٧ ز).
- پێشەوا (عبدالكريم بن محمد المدرس)(م ٢٠٠٥ ز).
- پێشەوا (متولي الشعراوي)(م ك).
- پێشەوا (السيد محمد بن علوي المالكي، الملقب بمحدث الحرمين) (م ٢٠٠٤ ز)[1].

---

١ – کەسایەتیەکانی تەسەووف لەبەر زۆری کۆتایی نایێ، تکایە سەیری: (حلية الأوليا و طبقات الصوفية و سير أعلام النبلاء و البداية والنهاية و طبقات الكبرى للشعراني .. هتد بكه).

**ئـەو زانـايـانـەی فـەرهـەنـگـيان دانـاوە سـەبـارەت بـەسـۆفـيـگـەری:**

- موفتى جمال الدين محمد إبن النقيب.
- قاضي القضاة شيخ عز الدين عبدالعزيز قاضي القضاة بدر الدين ابي عبدالله محمد.
- شيخ الإسلام برهان الدين إبراهيم بن سعد بن جماعة الشافعي.
- شيخ ابي عبدالله محمد بن فورات.
- قاضي القضاة تقي الدين ابي عبدالله محمد بن حسين بن روزةين حموي الشافعي.
- شيخ الإسلام صدر الدين أبي حسن محمد.
- شيخ عماد الدين ابي فتح محمد.
- شيخ الإسلام معين الدين ابي عبدالله.
- الإمام أبي حيان الأندلوسي.
- قطب الدين القسطلاني.
- كمال الدين بن نقيب.
- ابي موسى المَدْيَنِي.
- نجم الدين أبي نعمان بشير بن أبوبكر حامد بن جُعْبري تبريزي.
- شيخ عبدالواحيد بن عاشر الأنصاري المالكي.
- شيخ احمد بن مصر البارك المتى (يان المبارك المتى).

**پـــلــه و پـــایــەی ســـۆفـیــگــەری:**

١) التوبة: تۆبه.

٢) الخوف: ترس.

٣) الرجاء: تکا، ئومێد، هیوا.

٤) القبض: خەمباری، توندی.

٥) البسط: دڵنیایی.

٦) الزهد: خۆنەویستی و دونیا بەکەم گرتن.

٧) الورع: خۆپارێزی.

٨) التوکل: پشت بەستن.

٩) الصبر: خۆڕاگری.

١٠)الشکر: شوکرانەبژێری.

١١)جهاد النفس: کۆششی دەروونی.

١٢)الرضا بالقضاء والقدر: ڕازی بوون به قەزا و قەدەر.

١٣)وازهێنان له بەندەکان (خەڵك).

**رێـــبـــاز (تـــەریـقـــەت)ە بـــەنـــاوبـــانـــگـــەکـــان:**

١) **رێبــــازی قــــادری:** شـێخ عبـدالقادری گـەیلانی(م ٥٦١ ک) دایمەزراندووە، رێبازەکەی دەگەڕێتەوە سەر شێخ (حسن البصری) (م ١١٠ ک).

٢) **رێبازی ریفاعی:** سید ابی عباس احمد بن حسن رفاعی(م ٥٧٨ ک) دایمەزراندووە، خەڵکی (بطحا)یە لە (ناصریة) لە عێراق.

٣) **رێبازی بەدەوی:** سید احمد بەدەوی(م ٦٣٤ ک) لە (فاس) لە دایك بووە، لە (طنطا) لە میصر کۆچی دوایی کردووە.

٤) **رێبــــازی دەســــوقی:** شـێخ إبـراهیم الدسـوقی(م ٦٧٦ ک) لـە دەسوق- میصر نێژراوە.

٥) **رێبازی ئەکبەریە:** شـێخ محیـی الـدین بـن عربـی، ناسـراو بـە (الشـیخ الأکـبر) لـە(م ٦٣٨ ک) دایمەزرانـدووە، وە رێبـازی قـادری لــە شــێخ (عبــدالرزاق کــوری شــێخ عبــدالقادری گەیلانی) وەرگرتووە.

٦) **رێبازی شاذلي:** شێخ ابی حسن الشاذلی(م ک) دایمەزراندووە.

٧) **رێبــــازی مەولــــەوی:** مــەولانا جـلال الــدین الرومــی(م ک) دایمەزراندووە.

٨) **رێبــازی نەقشــبەندی:** شـێخ بهـاء الـدین محمـد بـن بخـاري، ناسراو بە شاهی نەقشبەند(م ٧٩١ ک).

٩) **رێبازی مەلامەتی:** شێخ ابو صـالح حمـون بـن عمـار، ناسـراو بە(م ٢٧١ ک).

١٠) **رێبازی تیجانی:** شێخ ابو عباس احمد التیجانی(م ١٢٣٠ ک) دایمەزراندووە.

**زنجیرەی سەرجەڵەی سۆفیەکان:**

**بەگشـتی ئـەهلی تەسـەووف ڕەچـەڵەکی خۆیـان لـە ڕووی ئیرشادەوە دەگەڕێننەوە بۆ ئەم زاتە پیرۆزانە:**

1) حەزرەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ).
2) ئیمام ابوبكر الصديق (رضي الله عنه).
3) ئیمام علي بن ابي طالب (كرم الله وجهه).
4) ئیمام حسن بن علي (رضي الله عنه).
5) ئیمام حسين بن علي (رضي الله عنه).
6) ئیمام سلمان الفارسي (رضي الله عنه).
7) شێخ حسن البصري (رضي الله عنه).
8) ئیمام قاسم بن محمد بن ابوبكر الصديق(رضي الله عنهم).
9) ئیمام زين العابدين علي بن حسين بن علي(رضي الله عنهم).
10) ئیمام محمد الباقر بن زين العابدين علي بن حسين(رضي الله عنهم).
11) ئیمام جعفر الصادق بن محمد الباقر بن زين العابدين علي(رضي الله عنهم).
12) ئیمام موسى الكاظم بن جعفر الصادق بن محمد الباقر(رضي الله عنهم).
13) ئیمام علي الرضا بن موسى الكاظم بن جعفر الصادق(رضي الله عنهم).
14) شێخ حبيب العجمي(رضي الله عنه).
15) شێخ داود الطائي(رضي الله عنه).
16) شێخ معروف الكرخي(رضي الله عنه).
17) شێخ بايزيد البسطامي(رضي الله عنه).
18) خواجة عبدالواحد(رضي الله عنه).
19) شێخ عبدالخالق غجدواني(رضي الله عنه).
20) شێخ إبراهيم بن أدهم(رضي الله عنه).

٢١)شيخ ابو علي الفارمدي(رضي الله عنه).

٢٢)شيخ سري السقطي(رضي الله عنه).

٢٣)شيخ جنيد البغدادي(رضي الله عنه).

٢٤)شيخ ابوبكر الشبلي(رضي الله عنه).

٢٥)تا دوا زنجيره.

## کاریگەری سۆفیگەری لەسەر شۆڕشەکانی کورد

لە راستیدا گەلێ لەو شۆڕشانەی کاریگەری زۆری بەسەر خەباتی بزووتنەوەی کورد هەبووە، ناتوانین بە هیچ جۆرێ لە سۆفیگەرییەوە دابڕێنین، زیاتر مەبەست لەو شۆڕشانەن کە لە باشووری کوردستان" ئەو پارچەیەی کەوتۆتە سنووری عێراقەوە مەبەستمانە، لەبەر ئەوە هەر لەسەرەتا و کۆتایی سەدەی نۆزدەدا شۆڕشی (شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری)، هەرچەندە مەڵبەندەکەی کوردستانی ئێران بوو، کەچی پڕوشکی بەهەموو لایەکی کوردستاندا پرژا، بەتایبەتی لە رووی بۆچوونی و فکری و جووڵانەوەی شۆڕشدا، لە کاتێکدا ئەو شۆڕشە بەهۆی هەوڵی دەوڵەتان و بگرە کاری نێودەوڵەتیشەوە کپ کرا، کەچی کاریگەرییەکانی لە نێو دڵی جەماوەر و خەڵکدا مایەوە.

ئەو شۆڕشە رەنگە لە رووی ناوچە و کاتەوە پابەند بێت بەخۆیەوە، بەڵام لە رووی فکر و داینەمۆی جوڵانەوەی کاریگەری فرەوانی هەبوو، گومان لەوەدا نییە (شێخ عوبەیدوڵڵا) لە پەیڕەوانی (تەریقەتی نەقشبەندی) بووە، لە گەلێ ناوچەی دەوروبەریەوە سۆفیان و پەیڕەوانی خۆی هەبوو، توانیویانە بە هەموو لایەك لە دەوری یەك کۆببنەوە، کەواتە ناوکی یەکەم گردبوونەوە لە پێناو ئامانجی خۆیاندا کە نەتەوەی کورد بووە، سۆفیگەری توانیویەتی رۆڵی سەرەکی هەبێت لەو گرد

بوونەوەیەدا تاکو بتوانێ یەکە یەکە و بەرە بەرە گرد بوونەوەی دیکە بەدوای خۆیدا رابکێشێت.

لەلایەکی دیکەوە حکومەتەکانی ئێران و دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ ئەوەی چەندە دژی یەك بوون، کەچی لە دوا ئامانجدا هەوڵی جدییان داوە بۆ ئەوەی ئەو شۆڕشە لەنێوبەرن و نەهێڵن زیاتر بەسەر ناوچەکانی دیکە بپرژێ، چونکە هەم پەیڕەوانی تەریقەت هەبوون و هەم کورد هەبوون، هەروەها لەسەر ئەو مەودایەش کاریان کردووە، کە بیروباوەڕەکانی شۆڕشی بخەنە یەك قاڵبەوە، دواجار هەموو ئەمانە و هاوکاری دیکە شۆڕشیان کپ کردۆتەوە، بەڵام نەتوانراوە لە رووی ئینتماوە بیروبۆچوونی شۆڕش لەنێو تاکەکانی کورد کپ بکرێ، لێرەوە سۆفیگەری لەم شۆڕشەدا بەشێوەیەکی گشتی بەلایەوە گرنگ بوو کە وەکو نەتەوە هاوسێکانی دیکەی پێناسی تایبەتی خۆی هەبێت، هەروەها ئەوەش بەتاکەکانی بدا کە ئەو نەتەوانە دەبێت لە رووی ماف و ئەرکەوە یەکسان بن.

پاش کپبوونەوەی شۆڕشی (شێخ عوبەیدوڵلا) گەلێ شۆڕشی دیکە هاتنە ئاراوە و پەیامیان خستە روو، یەکێ لەو شۆڕشانە شۆڕشی (شێخ عەبدولسەلامی بارزانی)ە.

شۆڕشـەکانی بـارزانیش لەگـەڵ ئـەوەی ڕەگێکـی قووڵیـان لـە ململانێـدا هەیـە، دیاریشـە داینـەمۆی سـەرەکی لـە خـودی سـۆفیگەرییەوە سـەری هەڵـداوە، بـە ڕێبەرایـەتی (شـێخ عەبدولسەلامی شەهید).

سـەرەتا لەگـەڵ دەوڵـەتی عوسمـانی لـە ململانـێ بـووە و دواتـر لەگەڵ دەوڵەتی عێراق.

بونیـادی بەیەکـەوە کۆبـووەوەی زۆربـەی زۆری شۆڕشـەکانی بـارزان تەریقـەتی نەقشبەندی بـووە، ئـەم تەریقەتـە وایکـردووە کـە هەر لە سەرەتاوە شێخەکانی لە ناوچەکانی خۆیانـدا هـەوڵی جـدی بـدەن بـۆ ئـەوەی عەدالـەتی کۆمەڵایـەتی دەسـتەبەر بکـەن، ئەمـەش دواجـار بـەرە بـەرە ناوچـەی دیکـەی بێتـە پـاڵ، بـۆ ئـەوەی گردبوونەوەیەکی گەورە دروست بکەن.

کەواتـە سـۆفیگەری لـە شۆڕشـەکانی بـارزان هـەر تـەنها بـۆ ململانـێ لەگـەڵ عوسمـانی و عێـراق نـەبووە، بەڵکو لـەباری ئایینی سیاسییەوە کشاوە بۆ باری کۆمەڵایەتیش، ئەمـەش خـاڵێکی گـرنگ بوو، بۆ ئەوەی تەسەووف بتوانێ گردبوونـەوەکان لـە یـەکتر قووڵتر و مـەتین بکـات و پەیامەکەشـی لـە ڕووی نەتەوەییـەوە هـەڵگری پـەیامی شۆڕشـەکانی پێشـتر بێـت، کەواتـە شۆڕشـەکان لـە نـاخی خۆیانـدا دروسـت بـوون، نـەوەك بـەهۆی هۆکـارە دەرەکییەکانـەوە هاتبنە ئاراوە، سۆفیگەریش گردبوونەوە و پاراسـتنی پەیامـەکانی لـە ئەسـتۆگرتووە و شـان بـە شـانی ئەرکـە نەتەوەییەکـەوە ڕۆیشتووە، چونکە سۆفیگەری لە ناخی کۆمەڵگای کوردەواریدا بە

قوولّی خراوه و بەهیچ جۆرێ نەتوانراوە لێی دابڕی، چونکە ناکرێ شۆڕش لە بونیادی کۆمەڵایەتی جودا بێت.

لە سەرەتای سەدەی بیستەم شۆڕشی (شێخ محمود) هاتە ئاراوە، لە کاتێکدا نەخشەی ناوچەکە لە سنووری سیاسییەوە گۆڕانکاری بنەڕەتی بەسەردا دەهات، (شێخ محمود) کە لە خانەدانی (بەرزنجی) و پەیڕەوانی (تەریقەتی قادری) بوو، ئالآی شۆڕشێکی هەڵکرد، کە پەیامەکانی تایبەت بوو بە گەلێکی ستەملێکراو.

بەو پێیەی شۆڕشی (شێخ محمود) لەماوەی گۆڕانکاری سیاسی ناوچەکە هاتە ئاراوە، بەهەمان شێوە لە مامەڵەشدا کەوتە بەرامبەر گۆڕانکاری لە هێزی سیاسی" لەلایەکەوە نەخشەی سیاسی لە قەوارەی دەوڵەتی عوسمانی بووە کارێکی حەتمی و لەلایەکی دیکەوە ململانێ لەسەر ئەو نەخشەیە توندتر بوو، تا دواجار دەوڵەتی عێراق دروست بوو، بەوهۆیەوە بەشێکی کوردستان لکا بەو دەوڵەتەوە.

بزوێنەران و پەیڕەوانی شۆڕش چ لە رووی سەرکردە و چ لە رووی جەماوەرییەوە پابەند بوون بە بیرۆکەی سۆفیگەرییەوە کە بەیەکەوەیان بەستبوونەوە، لەگەڵ ئەمەش درکیان بەوە کردبوو کە کورد وەکو نەتەوەکانی دیکە دەبێت خاوەن قەوارەی و کەسایەتی خۆی بێت، هەرچەندە مامەڵەکردن لەو ساتانەدا لە نێو زلهێزەکانی جیهان سەختە، بەڵام بیرۆکە و پەیامی شۆڕش هەرمایەوە.

شۆڕشــی (شـێخ محمـود) تـوانی بۆنـەوەکانی داهـاتووش بیسـەلمێنێ کـە پـەیامی نەتـەوەیی نـاکرێ لـەناو بچـێت، ئـەم پەیامـەش بـۆ خـۆی تایبـەت بـوو بـە نەتـەوەی کـورد، کەچـی بەشێوەیەکی سەرەکی سۆفیگەری توانی ئەو پەیامە هەڵگرێ بۆ قۆنـاغێکی دیکـەی ببـا، رەنگـە بۆخـۆی خـودی پەیامەکـە نـەبێت، بەڵام داینەمۆ و کاریگەریی بەهێز بووە تاکو پەیامەکە بگەیەنێتە قۆنـاغێکی دیکـە، هاوکـات لـەو سـەردەمەدا گـەلێ هۆکـاری دیکـە بەتایبەتی مەسەلەی روناکبیری هاتە ئاراوە کە دواتر کاریگـەری قووڵی بەسەر بیری نەتەوەیی کوردەوە بەجێ هێشت.

یـەکێ لـەو کاریگەرییانـەی شۆڕشـی (شـێخ محمـود) بـەجێی هێشـت مامەڵـەکردن بـوو لـە کۆڕەپـانی نێودەوڵـەتی کـە تیایـدا دەسـتەی نەتـەوەکان (عصـبة الأمـم) لـەبارەوە بڕیـاری لێ دەرکـرد و تیایـدا بـۆ کـورد چـەند مافێـك دەسـتەبەر بکـرێ، ئـەو مافانـەش هەرچـەندە وەکـو بـاس کـردن هاتــە ئـاراوە و دەوڵــەتی تــازە دامەزراوی عێراقی لێ ئاگادار کردەوە، ئەمانەش بە کپ بوونـەوەی شۆڕشیش هەر لە ئارادا بووە، دواجار بیرو پەیامی شۆڕشی لـەنێو هەناوی خەڵکیدا هەرماوەتەوە.

دەتوانین لە بارەی کاریگەری سۆفیگەری لەسەر شۆڕشەکانی کورد ئەم خاڵانەی خوارەوە بخەینە ڕوو:

١) سۆفیگەری توانیویەتی بارێکی ڕێکخستنی مەزن لە شۆڕشەکان بگێڕێ، چونکە ئەو ئاستەی بۆ کاروباری ڕێکخستن لەو سەردەمەدا باو بووە، بەگوێرەی پێویست نەبووە و بگرە ئەو جۆرە مەعریفەیەشی نەبووە لەبەر ئەوە سۆفیگەری ئەو ئەرکەی لە ئەستۆ گرتووە تاکو سەرکردە و ئەندامان و جەماوەرەکەی بە شێوەیەك لە شێوەیەك ڕێك بخات، ئەم ڕێکخستنەش بەهۆی سۆفیگەرییەوە بووە، ڕەنگە لە شۆڕشێك بۆ شۆڕشێکی دیکە جیاوازی بچووك هەبێت، بەڵام کاریگەری کۆمەڵایەتی لەپشت ئەو جیاوازییەوە بووە.

٢) بەشێوەیەکی گشتی هەردوو تەریقەت لە شۆڕشەکان دا بەشدارییان کردووە، کەواتە پەیامی گرنگ هی نەتەوە بووە، بۆیە هەردوو تەریقەتی (قادری و نەقشبەندی) لە شۆڕشەکاندا بوونیان هەبووە، شۆڕشی بارزانی تەریقەتی نەقشبەندی لە پشتیەوە بووە و شۆڕشی (شێخ محمود) تەریقەتی قادری لە پشتیەوە بووە، ئەمەش خاڵێکی ئیجابییە.

چونکە بە پلەی یەکەم بونیادی کۆمەڵایەتی ئەو ئامادەگییەی تێدا بووە، دیاریشە تەریقەتەکان ڕۆڵی کاریگەریان هەبووە بەسەر شۆڕش، هەروەها ئەمەش دەیسەلمێنێ کە گیانی لێبوردن و ئاشتەوایی و نەتەوەیی زاڵە، نەوەك دوژمنایەتی نێوان تەریقەتەکان کە لە

سەردەمێك لە سەردەمەكاندا زاڵ بووە، لەبەر ئەوە هەردوو تەریقەت لە شۆڕشەكانی كورد كاریگەریان هەبووە و خەڵكیان لە خۆیان كۆكردۆتەوە.

٣) لەگەڵ ئەوەی تەریقەتەكان جودا بوون، كەچی یەك ئامانجیان هەبووە، ئەویش ئامانجێكی نەتەوەیی بووە، تاكو عەدالەتێك لە نێوان نەتەوەكانی ناوچەكە فەراهەم بكا.

٤) ئەم قۆناغە بریتی بووە لە قۆناغی ئینتیقالی كە سۆفیگەری ئەو رۆڵەی گێڕاوە، تاكو لەمەودوا خەبات و شۆڕشەكانی كورد لە قالبی حزب و رێكخراوەییدا ئەنجام بدرێن، لەبەر ئەوە نەتوانراوە دەستبەرداری سۆفیگەری بین.

٥) كاریگەری سۆفیگەری لە هەناوی كاریگەری كۆمەڵایەتیەوە بووە، بۆیە لە توانای هەبووە پەیامی شۆڕشەكان هەڵگرێ، هەروەها پاش كپ بوونەوەی شۆڕشیش ئەم پەیامەی هەڵگرتووەو كاریگەری بەسەر تاكەكان جێهێشتووە.

## سەرچاوەکـــان


١) القران الكريم.

٢) ئەمين علاء الدين نەقشبەندی، تەسەووف چی يە؟ بەغدا، ١٩٨٥.

٣) بكر سيد عبدالرزاق محمود السامرائي، قواعد الأخلاق في التصوف الإسلامي، دار الشؤون الثقافية العامة، ط١، بغداد، ٢٠٠٠.

٤) حسن الشرقاوي، معجم الألفاظ الصوفية.

٥) سعيد حوى، المستخلص في تزكية الأنفس، دار السلام، ط٤، ١٩٨٨.

٦) السهروردي، عوارف المعارف، (لەبەرگی پێنجەمی "إحياء علوم الدين")دا چاپکراوە، بيروت، بلا مكان طبع.

٧) عبدالقادر عيسى، حقائق عن التصوف، مطبعة النواعير، الرمادي، ط ٥، ١٤١٣ ه- ١٩٩٢ م.

٨) أبو القاسم عبدالكريم بن هوزان القشيري، الرسالة القشيرية في علم التصوف، بغداد.

٩) عدنان حسين العوادي، الشعر الصوفي، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٦ م.

١٠) عزيز السيد جاسم، متصوفة بغداد، شركة المعرفة للنشر والتوزيع، بغداد، ١٩٩٠ م.
١١) الكلاباذي، التعرف لمذهب اهل التصوف، مصر، ١٩٦٩ م.
١٢) ماجد فخري، مختصر تأريخ الفلسفة العربية، بيروت.
١٣) هەفتەنامەی بارزان
١٤) گۆڤاری كاروان